پوختەی کتێبی :

# عِلَلُ الحَدِيثِ وَمَعرِفَةُ الرِّجَالِ وَالتَّارِيخُ

للإمام الحجة أبي الحسن علي بن المديني

(٢٣٤ هـ) رحمه الله تعالى

لەگەڵ پاشکۆیەک دەربارەی ناسینی

زانایانی سەلەف رحمهم الله

• دانيال •

١٤٤٥ هـ

دەروازەیەک بۆ ئاشنابوون بە زانستەکانی فەرموودە لەسەر مەنهەجی سەلەف : (٢)



البويطي ئەڵێت : بە الشافعی ـم وت : زۆر خۆت ماندوو ئەکەیت بە نووسینەوەی کتێب، وە خەڵک سەیری کتێبەکانت و نووسینەکانت ناکەن !

وتی : (ڕۆڵەکەم، ئەمە حەقە، وە حەقیش نافەوتێت) .



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ئەم کتێبە لە دووبەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمیان بریتیە لە کتێبی (عِلَلُ الحَديثِ وَمَعرِفَةُ الرِّجَالِ وَالتَّارِيخُ) ی ئیمامی جرح و تعديل أبو الحسن علي بن عبدالله المديني رحمه الله تعالى .

لە کتێبەکەدا باسی ئەو ئیمامە بەڕێزانەی سەلەف ئەکات کە فەرموودەی زۆریان لێوە گێڕدراوەتەوە، پاشان باسی تەلەبە و تەلەبەی تەلەبەکانیان ئەکات .

زانایانی سەلەف رحمهم الله تەنها ئەوەندە نین کە ئیمام رحمه الله لێرەدا باسی کردوون، بەڵکو زۆر لەوە زیاترن، بەڵام ئیمام رحمه الله تەنها باسی کەسە دیار و ناسراوەکانی کردووە .

هەربۆیە فێرخوازی سەرەتایی ئەتوانێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاری نوێ ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، وە فێرخوازی پێشکەوتووش ئەتوانێت بیخوێنێتەوە بۆ بەبیرهێنانەوەی خۆی .

لەگەڵ ئەوەشدا ئیمام رحمه الله لە باسی هەندێک کەسدا (بۆ نمونە وەکو الحسن البصري) ڕۆئەچێت و لەچاو زانایانی تر بە درێژی باسی ئەکات .

لە هەمان کتێبدا ئیمام باسی هەندێک فەرموودە و ڕێگاکانی ڕیوایت کردن و عیلەلەکانی ئەکات، پاشان هەر خۆی بڕیار لەسەر زۆربەی فەرموودەکان ئەدات، ئێمەش ئەوەندەی بتوانین سوود لە وتەکانی ئیمام رحمه الله وەرئەگرین بۆ ئاشنابوون بە مەنهەجی سەلەف لە بواری فەرموودەوانیدا .

وە بەشی دووەمی ئەم کتێبەش باس و زانیاری لەسەر چەند زانایەکی سەلەف رحمهم الله تێدایە، فێرخواز بە خوێندنەوەی هەردوو بەشی کتێبەکە بە ویستی الله تعالی تاڕادەیەک زانیاری دەربارەی زانایانی سەلەف و ئەهلی سوننە و جەماعە پەیدا ئەکات .

لە کتێبی یەکەمدا وتەکانی ئیمام رحمه الله بەش بەش دانراون بۆ ئاسانکاری بۆ خوێنەر.

الله تعالی لەگەڵ ئەهلی حەدیث حەشرمان بکات و بمانکاتە بەهەشتەوە، وە داواکارم کە ئەمکارە تەنها لە پێناو خۆی و لەسەر سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت، لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن .

- **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[تەماشام کرد بینیم سەنەدەکان لە دەوری شەش کەسە :

لە ئەهلی مەدینە :

١ - إبن شِهاب، محمد بن مسلم بن عبدالله بن شهاب، کونیەکەی أبو بکر ە، ساڵی (١٢٤ هـ) وەفاتی کردووە .

وە لە ئەهلی مەککە :

٢ - عَمرو بن دینار مەولای جُمَح، کونیەکەی أبو محمد ـە، ساڵی (١٢٦ هـ) وەفاتی کردووە .

وە لە ئەهلی بەسرە :

٣ - قَتادة بن دُعامة السدُوسي، کونیەکەی أبو الخطاب ە، ساڵی (١١٧ هـ) وەفاتی کردووە .

٤ - وە یحیی بن أبي كَثير، کونیەکەی أبو نصر ە، ساڵی (١٣٢ هـ) لە یەمامە وەفاتی کردووە .

وە لە ئەهلی کوفە :

٥ - أبو إسحاق، ناوی عمرو بن عبدالله بن ود ە، ساڵی (١٢٩ هـ) وەفاتی کردووە.

٦ - وە سُلَیمان بن مِهران، مەولای بني کاهِل، لە بني أسد ە، کونیەکەی أبو محمد ە، ساڵی (١٤٨ هـ) وەفاتی کردووە] وتەی ئیمام کۆتایی هات .

## • ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

لێرەدا ئیمام باسی چەند زانایەک ئەکات لە تابیعیەکان، وە کاتێک ئەڵێت [سەنەدەکان] ئەوە مەبەستی سەنەدی فەرموودە صحیح ەکانە .

هەر یەکێک لەم شەش تابیعیە مُکثِر بوون، واتە فەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە.

هەر یەکێک لەم شەش تابیعیە تەلەبەی بەشێک لە هاوەڵان رضي الله عنهم بوون، وە لە هەمان کاتدا تەلەبەی بەشێک لەو تابیعیە گەورانە بوون کە تەلەبەی هاوەڵان بوون رضي الله عنهم .

بۆ نمونە الزهري تەلەبەی تابیعیە گەورە مەدینەییەکان بووە .

وە عمرو بن دينار تەلەبەی خودی إبن عباس رضي الله عنهم و بەشێکی زۆری تەلەبەکانی إبن عباس بووە .

وە ئەڵێت [مەولای جُمَح] یان [مەولای بني کاهِل]، وشەی (مەولا) واتە بەندەی ئازادکراو، واتە کەسێک (بۆ نمونە) دێت بەناوی عمر و کۆیەلەیەک بەناوی حسن ئەکڕێت، پاشان ئازادی ئەکات، ئیتر حسن پێی ئەوترێت مەولای عمر، وە نەوەکانی حسن پێیان ئەوترێت مەولای عمر .

واتە شەرت نیيە عمرو بن دينار خۆی بەندەی ئازادکراوی جُمَح بێت، لەوانەیە یەکێک لە باوک یان باپیری بەندە بووبێت و ئازادکرابێت، وە لەوانەیە خۆشی بەندە بووبێت و ئازادکرابێت .

## دەربارەی إبن شهاب الزهري

- إبن شهاب ئەڵێت : (هیچ کەسێک هێندەی من ئارامی نەبووە لەسەر بەدەستهێنانی زانست، وە هیچ کەسێک وەکو من بڵاوی نەکردووەتەوە) .

إبن شهاب ساڵی (٥٠ هـ) لەدایک بووە .

## دەربارەی عمرو بن دينار

- شعبة ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە وەکو عمرو بن دینار بێت) .

عمرو بن دینار ساڵی (٤٦ هـ) لەدایک بووە .

## دەربارەی قتادة

- سفيان الثوري ئەڵێت : (بۆ هیچ کەس هەبوو وەکو قتادة بێت ؟!) .

قتادة هەردوو چاوانی بە زکماکی نابینا بوون، واتە الضَرير بووە، ساڵی (٦١ هـ) لەدایک بووە، لە تاعونەکەی واسط دا وەفاتی کردووە .

## دەربارەی یحيی بن أبي كثير

- أيوب السختياني ئەڵێت : (لەسەر زەوی هیچ کەسێکی لێنەماوە وەکو یحیی بن أبي کثیر بێت).

وە ئەڵێت : (هیچ کەسێک ناناسم لە دوای الزهري شارەزاتر بێت بە فەرموودەی ئەهلی مەدینە لە یحیی بن أبي کثیر) .

## دەربارەی أبو إسحاق السبيعي

أبو إسحاق السبيعي ساڵی (**٣٣** هـ) لەدایک بووە، وە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تووشی تێکەڵکردن (إختلاط) بووە، سفیان الثوري پێش إختلاط ەکەی ڕیوایەتی لێوە کردووە .

- أبو داود الطيالسي وتی : (پیاوێک بە شعبة ی وت : ئایا أبو إسحاق فەرموودەی بیستووە لە مجاهد ەوە ؟

شعبة وتی : جا ئیشی چییە بە مجاهد؟ ئەو لە فەرموودەدا باشتر بوو لە مجاهد و الحسن و إبن سيرين) .

## دەربارەی الأعمش

الأعمش لە تەبەقەکەی خۆیدا زاناترین کەسە بە فتوا و وتەکانی عبدالله بن مسعود رضي الله عنه .

بزانە رحمک اللە زانا بەناوبانگ و فەرموودەوانەکانی تابیعین تەنها لەم شەش زانایەدا کورت نەبووەتەوە کە ئیمام باسیان ئەکات، بەڵکو زۆر زانای تریش هەن، بە دەیان زانای تر هەن، بەڵام بە گشتی سەنەدی فەرموودە صحیح ـەکان لەسەر ئەم شەش زانایەیە چونکە (مُكثِر : زۆر فەرموودەیان گێڕاوەتەوە) بوون.

هۆکاری زۆری گێڕانەوەی فەرموودەشیان بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە بەشێکیان هەم تەلەبەی هاوەڵ بوون، هەم تەلەبەی ئەو تابیعیانە بوون کە تەلەبەی هاوەڵەکان بوون، بەهۆی ئەمەوە زانستی هاوەڵان و تابیعیەکانیشیان وەرگرتووە.

بۆ نمونە عمرو بن دینار تەلەبەی إبن عباس رضي اللە عنهم بووە، وە مجاهد و سعید بن جبیر و عکرمة و چەندین گەورە تابیعی تر تەلەبەی إبن عباس بوون.

پاشان مجاهد و سعید بن جبیر لە هەمان کاتدا تەلەبەی عبداللە بن عمر رضي اللە عنهما بوون.

کەواتە کاتێک عمرو بن دینار ئەبێت بە تەلەبەی عبداللە بن عباس ئەوە زانستەکەی وەرئەگرێت .

کاتێک ئەشبێت بە تەلەبەی مجاهد و سعید بن جبیر زانستی هەردوو هاوەڵی بەڕێز عبداللە بن عباس و عبداللە بن عمر یان لێ وەرئەگرێت، وە لە هەمان کاتیشدا زانستی خودی مجاهد و سعید بن جبیر یش وەرئەگرێت .

بەم شێوەیە عمرو بن دینار کۆکەرەوەی زانستەکەیانە و ئەبێت بە مُكثر، جا کاتێک طالب عیلمەکانی پاش خۆی ئەزانن کە کۆکەرەوەی ئەم هەموو زانستەیە، زۆرترین کەس ئەبن بە تەلەبەی عمرو بن دینار بە بەراورد بە زانا

تایبیعیەکانی تر و فەرموودە و ئاثاری زۆری لێوە ئەگێڕنەوە، بەم شێوەیە ئەبێت بە مُکثر.

بۆ نمونە علقمة و الأسود تەلەبەی عبدالله بن مسعود ـن رضي الله عنه، وە لە هەمان کاتدا علقمة تەلەبەی عمر بن الخطاب بووە رضي الله عنه، وە الأسود تەلەبەی دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها بووە .

وە إبراهيم النخعي خزم و تەلەبە و کۆکەرەوەی زانستی علقمة و الأسود ـە، وە الأعمش تەلەبەی إبراهيم النخعي و چەندین زانای ترە، هەربۆیە الأعمش کۆکەرەوەی زانستی عبدالله بن عباس و علقمة و الأسود و النخعي و چەندین زانای ترە، بەم شێوەیە طالب العلم زیاتر ڕووی تێئەکەن و زۆر فەرموودەی لێوە ئەگێڕنەوە و ئەبێت بە مُکثِر.

ئەو چوار زانایەی تریش کە ئیمام باسی ئەکات بەم هەمان شێوەن، لەبەر درێژنەبوونەوەی باسیان ناکەین .

• **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[پاشان زانستی ئەو شەش كەسە گوازرایەوە بۆ ئەو هاوەڵانەیان كە كتێبیان نووسی :

لە ئەهلی مەدینە :

**١** - مالِک بن أنس بن أبي عامر الأصبَحي، لە بَني تَيمِ الله یە، ساڵی (**١٧٩** هـ) وەفاتی كردووە، لە إبن شِهاب ـەوە فەرموودەی بیستووە .

**٢** - وە محمد بن إسحاق بن يَسار، مەولای بَني مَخرَمَة، كونیەكەی أبو بكر ـە، ساڵی (**١٥٢** هـ) وەفاتی كردووە، لە إبن شِهاب و الأعمَش ـەوە فەرموودەی بیستووە .

وە لە ئەهلی مەككە :

**٣** - عبدالمَلک بن عبدالعَزيز بن جُرَيج، مەولای قُرَيش، كونیەكەی أبو الوليد بووە، ساڵی (**١٥١** هـ) وەفاتی كردووە .

**٤** - وە سُفيان بن عُيَينة بن مَيمون، مەولای محمد بن مُزاحِم، برای الضَّحَّاک بن مُزاحم الهلالي، كونیەكەی أبو محمد ـە، ساڵی (**١٩٨** هـ) وەفاتی كردووە .

سفيان گەیشتووە بە إبن شهاب و عمرو بن دينار و أبو إسحاق و الأعمش .

وە لە ئەهلی بەسرە :

٥ - سعيد بن أبي عَرُوبة، مەولای بَني عَدي بن يَشكر، ناوی سعيد بن مِهران ە، کونیەکەی أبو نَّصر ە، ساڵی (١٥٨) یان (١٥٩ هـ) وەفاتی کردووە .

٦ - حَمَّاد بن سَلَمة، پێم وابێت مەولای بني سُلَيم ە، کونیەکەی أبو سَلَمة یە، ساڵی (١٦٨ هـ) وەفاتی کردووە .

٧ - أبو عَوَانة، ناوی الوَضَّاح ە، مەولای يزيد بن عطاء الواسِطي یە، ساڵی (١٧٥ هـ) وەفاتی کردووە .

٨ - شُعبة بن الحَجاج، أبو بسطام، مەولای الأشاقر ە، ساڵی (١٦٠ هـ) وەفاتی کردووە .

٩ - مَعمَر بن راشِد، کونیەکەی أبو عُروة یە، مەولای لِحُدان ە، ساڵی (١٥٤ هـ) لە یەمەن وەفاتی کردووە، فەرموودەی بیستووە لە إبن شهاب و عمرو بن دينار و قتادة و يحيى بن أبي كثير، وە لە أبي إسحاق .

وە لە ئەهلی کوفە :

١٠ - سُفيان بن سعيد الثَوري، کونیەکەی أبو عبدالله یە، ساڵی (١٦١ هـ) وەفاتی کردووە .

وە لە ئەهلی شام :

١١ - عبدالرحمن بن عَمرو الأوزاعي، کونیەکەی أبو عمرو یە، ساڵی (١٥١ هـ) وەفاتی کردووە .

وە لە ئەهلی واسط :

١٢ - هُشَيم بن بَشير، مەولای بني سُلَيم، كونيەكەی أبو معاوية يە، ساڵی (١٨٣ هـ) وەفاتی كردووە] وتەی ئيمام تەواو بوو .

## ● ڕوونكردنەوەو زانیاری زیاتر :

ئەو شەش كەسەی كە ئيمام باسی كردن، تەلەبەی زۆريان هەبووە، لەم بەشەدا باسی هەندێک لەو تەلەبانەيان ئەكات كە كتێبيان نووسيوە .

## دەربارەی مالک بن أنس

يەكەمجار بە مالک بن أنس دەست پێ ئەكات، كە ساڵی (٩٣ هـ) لە دايک بووە، خاوەنی كتێبی (الموطأ) ە .

- الشافعي دەربارەی ئەڵێت : (ئەگەر فەرموودە باس كرا ئەوە مالک ئەستێرەيە)، وە يەكێكە لە جێگيرترين كەسەكانە لە الزهري و نافع ی مەولای عبدالله بن عمر رضي الله عنهما .

## دەربارەی محمد بن إسحاق

پاشان محمد بن إسحاق كە ساڵی (٨٠ هـ) لەدايک بووە، خاوەنی كتێبی (سيرة) ی رسول الله ﷺ ە .

## دەربارەی إبن جريج

پاشان إبن جريج کە ساڵی (٨٠ هـ) لەدایک بووە، وە خاوەنی کتێبی (التفسير) ە، تەلەبەی تایبەتی عطاء بن أبي رباح بووە، وە عبدالرزاق الصنعاني تەلەبەی تایبەتی بووە .

## دەربارەی سفيان بن عيينة

پاشان سفيان بن عيينة ساڵی (١٠٧ هـ) لەدایک بووە، لە ساڵی کۆتایی تەمەنیدا وازی لە گێڕانەوەی فەرمووده هێناوە، وە کتێبێکی هەبووە بەناو (الجامع)، بەڵام ئێستا بەردەست نییە .

## دەربارەی سعيد بن أبي عروبة

پاشان سعيد بن أبي عروبة دەوروبەری ساڵی (٧٥ هـ) لەدایک بووە، وە خاوەنی کتێبی (المناسك) ە، لە جێگیرترین کەسەکانە لە قتادة دا .

- أبي عوانة ئەڵێت : (لەوکاتەدا لەلای ئێمە هیچ کەسێک نەبوو حافظ تر بێت لە سعيد بن أبي عروبة) .

## دەربارەی حماد بن سلمة

پاشان حماد بن سلمة ساڵی (**٩١** هـ) لەدایک بووە، کتێبەکانی فەوتاون، جێگریترین کەسە لە ثابت البُناني .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هەر کەسێکت بینی تانەی ئەدا لە حماد بن سلمة، ئەوە تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلامەتیەکەی ) .

## دەربارەی شعبة بن الحجاج

پاشان شُعبة بن حجاج ساڵی (**٨٠** هـ) لەدایک بووە .

- يحي بن سعيد القطان ئەڵێت : (هەرگیز هیچ کەسێکم نەبینیوە فەرموودەکانی باشتر بێت لە فەرموودەکانی شعبة ) .

## دەربارەی معمر بن راشد

پاشان معمر بن راشد ساڵی (**٩٣** هـ) لەدایک بووە، تەلەبەی ئەو شەش کەسە بووە کە ئیمام یەکەمجار باسی کردن، کتێبێکی هەیە بەناوی (الجامع)، وە کتێبەکەی لەگەڵ (المصنف) ی عبدالرزاق دا لە چاپی دار التأصیل چاپکراوە.

## دەربارەی سفيان الثوري

پاشان سفيان الثوري ساڵی (**٩٧** هـ) لەدايک بووە، کتێبی (التفسير) و (الفرائض)ی هەيە .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (سفيان بن عيينة پێی وتم : هەتا ئەمريت چاوەکانت کەسێکی وەکو سفيان الثوري نابينن) .

## دەربارەی الأوزاعي

پاشان الأوزاعي ساڵی (**٨٨** هـ) لەدايک بووە، کتێبێکی هەيە بەناوی (المسند)، ناسراوە بە ڕەيحانەکەی شام، ئيمام ئەڵێت کە ساڵی (**١٥١** هـ) وەفاتی کردووە، صەواب ئەوەيە ساڵی (**١٥٧** هـ) وەفاتی کردبێت، والله أعلم .

## دەربارەی هشيم

لە کۆتاييدا هشيم بن بشير ساڵی (**١٠٤** هـ) لەدايک بووە، شێخی ئيمام أحمد بووە .

- **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[پاشان زانستی ئەو دوازدە كەسە كۆبوويەوە لەلای شەش كەس :

١ - لەلای يحيى بن سعيد القَطان، كونيەكەی أبو سعيد ە، مەولای بەنی تميم ە، ساڵی (١٩٨ ه) لە مانگی صفر وەفاتی كردووە .

٢ - وە يحيى بن زكريا بن أبي زائِدة، كونيەكەی أبو سعيد ە، مەولای هەمدان ە، ساڵی (١٨٢ ه) وەفاتی كردووە .

٣ - وە وكيع بن الجَراح بن مَليح بن عدي بن فَرَس، كونيەكەی أبو سفيان ە، ساڵی (١٩٧ ه) وەفاتی كردووە .

٤ - وە عبدالله بن المبارك، حَنظَلي ە، كونيەكەی أبو عبدالرحمن ە، ساڵی (١٨١ ه) لە هَيت وەفاتی كردووە .

٥ - وە عبدالرحمن بن مَهدي الأسَدي، كونيەكەی أبو سعيد ە، ساڵی (١٩٨ ه) وەفاتی كردووە .

٦ - وە يحيى بن آدم، كونيەكەی أبو زكريا يە، وا بزانم مەولای خالد بن عبدالله بن أسيد ە، ساڵی (٢٠٣ ه) وەفاتی كردووە] وتەی ئيمام تەواو بوو .

## • ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

لێرەدا ئیمام دێت باسی شەش کەسی دیکە لە زانایانی سەلەف ئەکات رحمهم الله، ئەم شەش زانایە فەرمووده و ئاثاری زۆریان لەلا بووە چونکە تەلەبەی بەشێکی زۆر لەو زانایانە بوون کە مُکثِر بوون .

## دەربارەی يحيى بن سعيد القطان

يحيى بن سعيد القطان، ساڵی (١٢٠ ھ) لەدایک بووە .

- محمد بن بندار الجرجاني ئەڵێت : (وتم بە إبن المديني : لەوانەی بینویتن کامیان سوودبەخشترین بوون بۆ ئیسلام ؟

وتی : يحيى بن سعيد القطان ) .

- عبدالرحمن بن المهدي و أحمد بن حنبل ئەڵێن : (چاوەکان کەسێکی وەکو يحيى القطان نابینن ) .

## دەربارەی إبن أبي زائدة

يحيى بن زكريا بن أبي زائدة، ساڵی (١٢٠ ھ) لەدایک بووە، قازی مەدائین بووە لە سەردەمی هارون الرشيد .

- إبن المديني ئەڵێت : (لە پاش الثوري هیچ کەسێک نەبوو هێندەی ئەو جێگیر بێت) .

## دەربارەی وكيع بن الجراح

وكيع بن الجراح، ساڵی (١٢٩ هـ) لەدایک بووە، ناوبانگی بە بەهێزی حِفظ و ئیتقان دەرکردووە .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (كان وكيع حافظاً حافظاً، ما رأيت مثله) .

- إبن عمار ئەڵێت : (لە زەمەنی وكيع دا هیچ کەسێک نەبوو لە کوفە لە وكيع فەقیهتر و شارەزاتر بێت بە فەرموودە، زۆر لێزان و لێهاتوو بوو) .

## دەربارەی عبدالله بن المبارك

عبدالله بن المبارك، ساڵی (١١٨ هـ)، پێشەوایەکی موجاهید بووە، نازناوی پێشەوای ئیمانداران ی لە فەرموودەدا پێبەخشراوە .

- شعيب بن حرب ئەڵێت : (إبن المبارك بە هیچ کەسێک نەگەیشتووە ئیللا إبن المبارك لەو باشتر بووە) .

- إسماعيل بن عياش ئەڵێت : (لەسەر ڕووی زەوی هیچ کەسێک نییە وەکو إبن المبارک، وا نازانم الله تایبەتمەندیەکی باشی دروست کردبێت ئیللا بەخشیویەتی بە إبن المبارک .

## دەربارەی عبدالرحمن بن مهدي

عبدالرحمن بن مهدي، ساڵی (١٣٥ هـ) لەدایک بووە .

- الشافعي ئەڵێت : (هیچ کەسێک ناناسم شان بدات لە شانی لەم بوارەدا - واتە بواری فەرموودە - ) .

- إبن المديني ئەڵێت : (زاناترین کەس بە فەرموودە عبدالرحمن بن مهدي ە ) .

## دەربارەی يحيى بن آدم

يحيى بن آدم، ساڵی (١٤٠ هـ) لەدایک بووە .

- إبن المديني ئەڵێت : (ڕەحمەتی الله لە يحيى بن آدم، ئەو زانستە چی بوو لەلای بوو !) وە زۆر پیایدا هەڵئەدا .

● **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[١ - ئەڵێن : (فتوادان و بڕیاردان لەناو هاوەڵان رسول الله ـدا ﷺ لە نێوان شەش كەسەدا بوو :

عمر، علي، عبدالله، زيد بن ثابت، أبي موسى، وە أُبَي بن كَعب ) .

٢ - مسروق ئەڵێت : (لەگەڵ هاوەڵانی رسول الله ـدا ﷺ تێكەڵبووم، هەیانبوو وەكو ئەو جامە ئاوە وابوو كە یەک كەس تێرئاو ئەكات، هەیانبوو وەكو ئەو جامە ئاوە وابوو كە دوو كەس تێرئاو ئەكات، هەیانبوو وەكو ئەو جامە ئاوە وابوو كە سێ كەس تێرئاو ئەكات، هەیانبوو وەكو ئەو جامە ئاوە وابوو كە هەموو خەڵكی تێرئاو ئەكات، وە عبدالله - إبن مسعود رضي الله عنه - وەكو ئەو جامە بوو) .

٣ - (وە لەناو هاوەڵانی رسول الله ـدا ﷺ تەنها ئەم سێ كەسە هاوەڵیان هەبوو، وە لەسەر مەزهەبەكەی ئەڕۆیشتن، و بە فتواكانی فتوایان ئەدا، وە رێگەی ئەوانیان گرتبوویەبەر، ئەوانیش : عبدالله بن مسعود، و زيد بن ثابت، وە عبدالله بن عباس) .

٤ - (هاوەڵانی عبدالله بن مسعود كە بە فتواكانی فتوایان ئەدا، وە بە خوێندنەوەكەی قورئانیان ئەخوێنەوە بریتی بوون لە :

عَلقَمَة بن قَيس

وه الأسود بن يزيد

وه مَسروق

وه عَبيدة السَّلماني

وه الحارث بن قَيس

وه عَمرو بن شُرَحبيل ) .

٥ - (إبراهيم النَخَعي كه زاناترين و شارەزاترين کەسه به هاوەڵانی عبدالله ئەڵێت : هاوەڵانی عبدالله ئەوانەی قورئانیان ئەخوێند و فتوایان ئەدا شەش کەس بوون، عَلقَمَة و الأسود و عَبيدة و عمرو بن شرَحبيل و الحارث بن قَيس ) ] وتەی ئیمام تەواو بوو .

## • ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

١ - کاتێک ئیمام ئەڵێت : [فتوادان و بڕیاردان لەناو هاوەڵان رسول الله دا ﷺ له نێوان شەش کەسەدا بوو]، واته ئەم شەش هاوەڵە بەڕێزە فتوای زۆریان داوه له بابەتەکانی دیندا .

عمر بن خطاب و علي رضي الله عنهم لەبەر ئەوەی که خەلیفە بوون، هەربۆیە مەسەلە و کێشەی زۆریان دێته لا تا چارەسەری بکەن و فتوای تێدا بدەن .

وە بە هەمان شێوە أبو موسى رضي الله عنه لە خەلافەتی عمر بن خطاب وە رضي الله عنه والی بووە، وە کەسێکی شارەزا بووە بە خوێندنەوەی قورئان، بە هەمان شێوەی أبي بن كعب رضي الله عنهم .

وە عبدالله بن مسعود رضي الله عنه زۆر شارەزایی هەبووە بە قورئان و هەر لە سەرەتاوە و موسوڵمان بووە، وە نێردراوە بۆ کوفە تا خەڵکی فێری دین و ئیسلام بکات.

وە زيد بن ثابت یش رضي الله عنه کۆکەرەوەی قورئان بووە لە خەلافەتی أبو بكر رضي الله عنه، وە کاتێک وەفات ئەکات عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەفەرموویێت (زانستێکی زۆر خرایە گۆڕەوە) .

بە کورتی و پوختی ئەم هاوەڵە بەڕێزانە لەبەر ئەوەی هەریەکەیان بە هۆکارێک خەڵکی ڕووی لێکردوون بۆ فێربوونی ئیسلام و بابەتە دینیەکان، ئیتر فتوای زۆریان داوە و لەچاو هاوەڵەکانی تردا رضي الله عنهم زیاتر ڕیوایەتیان لێوە کراوە .

وە لە ڕیوایەتی تردا ناوی هاوەڵی بەڕێز أبو الدرداء یش هاتووە رضي الله عنه .

ئەم قسەیە مانای ئەوە نییە کە هاوەڵانی تر فتوایان نەدابێت، بەڵام ئەم شەش هاوەڵە بەڕێزە لەچاو ئەوانی تردا فتوای زیاتریان داوە .

**٢** - ئەم قسەیەی مَسروق مانای ئەوەیە کە هاوەڵانیش رضي الله عنهم لەناو خۆیاندا لەڕووی بڕی ئەو زانستەی پێیان بووە جیاواز بوون، ئەمەش چەند هۆکارێکی هەیە :

- زوو موسوڵمان بوون .

- بەسەربردنی کاتێکی زیاتر لەگەڵ رسول الله ﷺ .

- پاشان گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە لە رسول الله یان ﷺ بیستووە .

- وە کاریان لەپاش وەفاتی رسول الله ﷺ، چونکە هی وایان هەبووە وەکو أبو ذر رضي الله عنه چووەتە شوێنێکی دوور بە تەنیا خۆی و ژنەکەی ژیاون، هی واش هەبووە وەکو عمر بن خطاب رضي الله عنه بووە بە خەلیفە و ڕۆژانە چەندین بابەت و کێشە ڕووی تێ ئەکات و ئەبێت قسەی تێدا بکات و فتوای تێدا بدات .

**٣** - واتە لەناو هاوەڵانی رسول الله دا ﷺ هەندێکیان کۆمەڵە تەلەبە و صاحِب یێکی تایبەتیان هەبووە، وە تەلەبەکانیان فتوایان لە ئەو هاوەڵە بەرێزە وەرگرتووە و پاشان هەر بە فتوای ئەو فتوایان بۆ خەڵکی داوە، واتە بە کورتی لەسەر مەزهەبی ئەو بوون، ئەمەش بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە مەزهەبایەتی بە شێوە ڕاست و حەقەکەی بیدعە نییە و سەلەف رحمهم الله کردوویانە، وەک چۆن گومڕاکان باسی ئەکەن .

٤ - لەم خاڵەدا باسی هاوەڵی هاوەڵە بەڕێزەکان ئەکات، هاوەڵ تایبەتترە لە تەلەبە، چونکە هاوەڵ کاتێکی زیاتر بەسەر ئەبات لەگەڵ ئەو کەسەی هاوەڵێتی ئەکات، وە زیاتر پێی شارەزایە .

- عَلقَمَة بن قَيس، مامی الأسود بن يزيد، وە خاڵی إبراهيم النخعي، ساڵی (٦٢ ه) وەفاتی کردووە، شەل بووە .

- الأسود بن يزيد، عَلقَمَة ی مامی بە تەمەن گەورەتر بووە، تەلەبەی دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها بووە، ساڵی (٧٤ ه) وەفاتی کردووە .

- مَسروق بن الأجدع، لە تابيعيە مخضرم ەکانە، تەلەبەی دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها بووە، ساڵی (٦٢ ه) وەفاتی کردووە، کاتێک منداڵ بووە دزراوە، دواتر دۆزراوەتەوە بۆیە پێی وتراوە مَسروق، واتە دزراو، وە قەمبوور (أحدَب) بووە، واتە لەڕووی جەستەوە .

- عَبيدة السَّلماني، لە تابيعيە مخضرم ەکانە، زۆر شارەزا بووە لە بابەتی میراتدا، ساڵی (٧٢ ه) وەفاتی کردووە، چاوێکی نابینا بووە .

- الحارث بن قَيس، پێش ساڵی (٦٠ ه) وەفاتی کردووە، چاوێکی نابینا بووە .

- عَمرو بن شُرَحبيل، ساڵی (٦٣ ه) وەفاتی کردووە .

لە هەندێک ڕیوایەتدا (شُريح القاضي) لە هاوەڵانی إبن مسعود رضي الله عنه هەژمار کراوە، شُريح ٦٠ ساڵ قازی بووە، لە تەمەنی ١٢٠ ساڵیدا وەفاتی کردووە، وە کۆسە بووە، واتە ڕیشی یان نەیبووە یان زۆر کەم بووە .

**٥** - إبراهيم النخعي شارەزاترین کەس بووە بە فتوا و وتەکانی إبن مسعود رضي الله عنه چونکە تەلەبەی هاوەڵەکانی إبن مسعود رضي الله عنه بووە، وە چاوێکی نابینا بووە .

لێرەدا ئاماژەمان بەوەدا کە زۆربەی هاوەڵەکانی إبن مسعود رضي الله عنه لەڕووی جەستەییەوە ناتەواویان هەبووە، بەڵام الله تعالى زۆر بەزیاتر لەوەی لێی سەندبوونەوە بۆی قەرەبوو کردنەوە، ئەویش بە پاداشتی بەردەوامیان هەتا قیامەت .

- **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[وە هاوەڵانی ئەو شەش کەسەی کە هاوەڵی عبدالله - بن مسعود - بوون، لەوانەی کە هەمان وتەی ئەوان دووبارە ئەکەنەوە و فتوا ئەدەن بە فتواکانیان بریتین لە :

- إبراهيم النَخَعي، وە إبراهيم گەیشتووە بە : الأسوَد و، عَلقَمَة و، مَسروق و عَبيدة، وە لە الحارِث بن قَيس و عَمرو بن شُرَحبيل هیچی نەبیستووە .

- وە عامِر، لە هەموویانەوە بیستوویەتی تەنها لە الحارِث بن قَيس ـەوە نەبێت، الحارِث لەگەڵ علي ـدا رضي الله عنه کوژرا، وە شارەزاترین کەس بوو دەربارەیان .

وە لە ئەهلی کوفە لەوانەی کە خاوەن مەزهەبی ئەوان بوون و فتوایان بە فتواکانیان ئەدا بریتین لە : الأعمَش، وە أبو إسحاق .

- وە الأعمَش شارەزاترینە دەربارەی ئەوانەی کە تێپەڕبوون لەوانەی باسمان کردن، بێجگە لە پیاوێک نەبێت، وە الأعمَش نەگەیشتووە بە هیچکامێکیان .

- أبو إسحاق گەیشتووە بە : الأسود بن يزيد، وە مَسروق، وە عَبيدة السَلماني، وە عَمرو بن شرحبيل، وە نەگەیشتووە بە عَلقمة و الحارِث بن قيس .

وە لە پاش ئەوان سُفيان الثوري هەمان مەزهەبی ئەوانی هەبوو وە فتوای بە فتواکانی ئەوان ئەدا .

وە پاش سُفيان، يَحيى بن سعيد القَطان لەسەر مەزهەبی سفيان الثوري و هاوەڵانی عبدالله - بن مسعود - بوو] وتەی ئیمام تەواو بوو .

● ڕوونکردنەوەو زانیاری زیاتر :

## دەربارەی إبراهيم النخعي

إبراهيم النخعي لە نێوان ساڵانی (**٤٧ - ٩٦** هـ) ژیاوە، دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها ی بینیوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوکات منداڵ بووە هیچی لێوە نەبیستووە، وە خزمی نزیکی علقمة و الأسود ە، وە چاوێکی نابینا بووە .

## دەربارەی الشعبي

- عامِر بن شَراحيل، ناسراو بە الشَعبي، لە نێوان ساڵانی (**٢١ - ١٠٠** هـ) ژیاوە، گەیشتووە بە نزیکەی **٥٠٠** هاوەڵ لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ .

## دەربارەی الأعمش

الأعمش، ناوی ڕاستی سُليمان بن مِهران ە، لە نێوان ساڵانی (**٦٠ - ١٤٨** هـ) ژیاوە، چاوی کز بووە بۆیە پێیان وتووە الأعمش .

وتەی ئیمام [بێجگە لە پیاوێک نەبێت] واتە الأعمش لە تەبەقەکەی خۆیدا شارەزاترینە دەربارەی إبن مسعود رضي الله عنه و هاوەڵانی رحمهم الله، جگە

لە پیاوێک نەبێت، واتە کەسێک هەیە لە تەبەقەکەی الأعمش دا شارەزاترە لە الأعمش دەربارەیان .

## دەربارەی أبو إسحاق السَبیعي

أبو إسحاق السَبیعي لە نێوان سالانی (٣٣ - ١٢٩ هـ) ژیاوە، وە یەکێکە لەو شەش ڕاویەی مەداری سەنەدەکانی فەرموودەیان لەسەرە .

## دەربارەی سُفیان الثوري

سُفیان بن سَعید الثَوري، پێشەوای ئیمانداران لە فەرموودەدا، لە نێوان سالانی (٩٧ - ١٦١ هـ) ژیاوە .

## دەربارەی یحیی بن سعید القطان

- یحیی بن سعید القطان، پێشەوای علل و جرح و تعدیل، لە نێوان سالانی (١٢٠ - ١٩٨ هـ) ژیاوە .

- **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[وە هاوەڵانی إبن عباس ئەوانەی کە لەسەر مەزهەب و ڕێچکەی ئەون بریتین لە : عَطاء، وە طاوس، وە مُجاهِد، وە جابِر بن زَید، وە عِكرِمة، وە سَعید بن جُبَیر .

زاناترینیان سَعید بن جُبَیر ە، وە جێگیرترینیانە تیایدا .

وە زاناترین کەس بەوان عَمرو بن دِینار ە، إبن عباس ی خۆش ئەویست، وە هاوەڵەکانیشی خۆش ئەویست .

وە إبن أبي نَجيح لەسەر ئەم مەزهەبە بوو، وە فتوای ئەدا بە فتواکانیان، وە گەیشتووە بە هەندێکیان و نەگەیشتووە بە هەندێکی تریان .

پاشان إبن جُرَيج و سُفیان بن عُیَینة هاوەڵانی إبن عباس یان خۆشئەویست، وە ڕێچکەی - إبن عباس - یان خۆش ئەویست .

إبن جريج لە طاوس و مُجاهِد ـەوە بیستوویەتی، وە نەگەیشتووە بە جابِر بن زَید، وە نەگەیشتووە بە عِكرِمة و سَعید بن جُبَیر یش ] وتەی ئیمام تەواو بوو.

## ● ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

ئەوانەی کە لەم بەشەدا ئیمام باسی کردوون هەموویان تەلەبەی نزیکی إبن عباس بوون رضي الله عنهما .

## دەربارەی عطاء بن أبي رباح

- عطاء بن أبي رباح، ساڵی (**١٠٤** ﻫ) وەفاتی کردووە، ڕەشپێست بووە، وە یەک چاوی نابینا و شەل بووە .

- **قتادة** ئەڵێت : (عطاء زاناترین کەسە بە مەناسیکی حەج) .

- **محمد بن سعد** ئەڵێت : (گوێم لە یەکێک لە زانایان بوو ئەیوت : عطاء ڕەشپێست و شەل و لێو گەورە و قەمبوور بووە، وە یەک چاوی بینیویەتی، پاشان ئەو چاوەشی کوێر بووە، فتوای مەککە هەمووی ئەڕۆشتەوە بۆلای ئەو و مجاهد، وە زۆربەی ئەگەڕایەوە بۆلای عطاء) .

## دەربارەی طاوس بن کیسان

- طاوس بن کیسان، فەقیهـ و شارەزای حەلاڵ و حەرام بووە، ساڵی (**١٠٦** ﻫ) وەفاتی کردووە .

- قيس بن سعد ئەڵێت : (طاوس لەناو ئێمەدا وەكو إبن سيرين وابوو لە بەسرە) .

## دەربارەی مجاهد بن جبر

- مجاهد بن جبر، ساڵی (١٠١ ھ) وەفاتی کردووە .

- حماد ئەڵێت : (عطاء و طاوس و مجاهد م بینی، وە لەگەڵیان تێکەڵ بووم، زاناترینیان مجاهد بوو) .

- محمد بن سعد ئەڵێت : (فەقیهێکی زانای جێ متمانە بوو، فەرموودەی زۆر بوو، لە سوجدەدا وەفاتی کرد) .

## دەربارەی جابر بن زيد

- جابر بن زيد، أبي الشعثاء، ساڵی (٩٣ ھ) وەفاتی کردووە .

- الزيات ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە إبن عباس دەربارەی شتێک .

وتی : پرسیار لە من ئەکەن و جابر بن زيد لە لەناوتاندایە کە یەکێکە لە زاناکان ؟).

- عمرو بن دينار ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە زاناتر بێت لە أبي الشعثاء) .

## دەربارەی عكرمة البربري

- عكرمة، مەولای إبن عباس رضي الله عنهما، ساڵی (**١٠٤** ھ) وەفاتی کردووە .

- عمرو بن دينار ئەڵێت : (جابر بن زيد هەندێک پرسیاری پێدام بیانپرسم لە عكرمة، وە وتی : ئەم عكرمة یە دەریایەکە پرسیاری لێ بکەن) .

(وترا بە سعيد بن جبير : هيچ کەسێک ئەناسیت لە خۆت زاناتر بێت ؟ وتی : بەڵێ، عكرمة) .

## دەربارەی سعيد بن جبير

- سعيد بن جبير، إبن أم الدهماء، ساڵی (**٩٥** ھ) الحجاج لەعنەتی الله تعالى ی لێبێت ئەیکوژێت .

- سعيد وتی : (کەسێک پرسیاری لە إبن عمر دەربارەی شتێک، فەرمووی : لە سعيد بن جبير بپرسە، ئەوەی من ئەیزانم دەربارەی ئەویش ئەیزانێت، بەڵام لە من باشترە) .

وە ئەگەر ئەهلی کوفە بهاتبانایە بۆ فتواداان عبدالله بن عباس رضي الله عنه ئەیفەرموو : (ئایا إبن أم الدهماء تان تێدا نییە ؟) .

- خصيف ئەڵێت : (زاناترينيان بە تەڵاق سعيد بن المسيب بوو، وە زاناترينيان بە حەج عطاء بوو، وە زاناترينيان بە حەڵاڵ و حەرام طاوس بوو، وە زاناترينيان بە تەفسير مجاهد بوو، وە سعيد بن جبير هەموو ئەوانەی تێدا بوو).

- محمد بن البراء ئەڵێت : (علي بن المديني بۆی گێڕاینەوە وتی : لەناو هاوەڵانی إبن عباس ـدا کەسی تێدا نییە وەکو سعید بن جبیر بێت .

وترا : طاوس یش ؟

وتی : نە طاوس و نە کەسی دیکە) .

- **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[وە هاوەڵانی زَید بن ثابِت، ئەوانەی کە لێیان وەرئەگرت و فتوایان بە فتواکانی ئەدا، هەیانە پێی گەیشتووە وە هەیانە پێی نەگەیشتووە، بریتین لە دوازدە کەس :

سَعِيد بن المُسَيِّب

وە عُروة بن الزُّبَير

وە قَبيصَة بن ذُؤَيب

وە خارجَة بن زَيد

وە سُلَيمان بن يَسَار

وە أبَان بن عُثمان

وە عُبَيدُالله بن عَبدِالله

وە القاسِم بن مُحَمَّد

وە سالِم بن عَبدالله

وە أبو بكر بن عبدالرَّحمن

وە أبو سَلَمَة بن عبدالرَّحمن

وە طَلحة بن عبدالله بن عَوف

وە نافِع بن جُبَير بن مُطعِم] وتەی ئیمام تەواو بوو .

## ● ڕوونکردنەوەو زانیاری زیاتر :

لێرەدا ئیمام باسی هاوەڵانی زید بن ثابت ئەکات و ئەڵێت : [هەیانە پێی گەیشتووە وە هەیانە پێی نەگەیشتووە]، بەکارهێنانی دەستەواژەی هاوەڵ لێرەدا جیاوازە لە بەکارهێنانی دەربارەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ، چونکە کاتێک ئەڵێن فلانە کەس هاوەڵی رسول الله یە ﷺ واتا ئیمانی پێ هێناوە و بینیویەتی و لەسەر ئەوەش وەفاتی کردووە .

بەڵام لە بواری مەزهەب دا بە کەسێک ئەوترێت هاوەڵ کە لەسەر هەمان مەزهەبی کەسی یەکەم بێت .

بۆ نمونە ئێستا إبن بطة الحنبلي (**٣٨٧** هـ) هاوەڵی ئیمام أحمد ـه (**٢٤١** هـ)، ئەگەر چی نەگەیشتووە بە ئیمام أحمد، بەڵام لەبەر ئەوەی لەسەر مەزهەبەکەیەتی و فتوا بە فتواکانی ئەو ئەدات و لەسەر ئەسڵەکانی ئەڕوات لە فتواداندا ئەوە پێی ئەوترێت هاوەڵ .

## دەربارەی سَعِيد بن المُسَيّب

- سَعِيد بن المُسَيّب، یەکێکە لە باشترین تابیعیەکان، وە یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە، دوای تێپەڕینی دوو ساڵ لە خیلافەتی عمر بن الخطاب رضي الله عنه لەدایک بووە، باوک و باپیری هاوەڵی رسول الله ﷺ بوون .

مەراسیلەکان بە صحیح دائەنرێن .

وە ئەڵێت : (هیچ کەسێک نەماوە زاناتر بێت لە من بەو فتوایانەی رسول الله ﷺ داونی، وە هەموو ئەو فتوایانەی أبو بکر رضي الله عنه داونی، وە هەموو ئەو فتوایانەی عمر رضي الله عنه داونی، وە عثمان رضي الله عنه) .

- القاسم بن محمد دەربارەی ئەڵێت : (ئەو گەورە و زاناترینمانە) .

## دەربارەی عُروة بن الزُّبَیر

- عُروة بن الزُّبَیر، یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە، تەلەبەی تایبەتی دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها بووە .

- عمر بن عبدالعزیز ئەڵێت : (هیچ کەسێک نییە زاناتر بێت لە عروة بن الزبیر) .

## دەربارەی قَبیصَة بن ذُؤَیب

- قَبیصَة بن ذُؤَیب، ساڵی (٨٦ ھ) وەفاتی کردووە .

- الشعبي ئەڵێت : (قبیصة زاناترین کەس بوو بە فتواکانی زید بن ثابت).

- الزهري ئەڵێت : (قبیصة لە زانایانی ئەم ئوممەتە بوو) .

## دەربارەی خارجَة بن زَيد

- خارجَة بن زَيد، ساڵی (١٠٠ ھ) وەفاتی کردووە، یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە، کوڕی هاوەڵی بەڕێز زيد بن ثابت رضي الله عنه.

کاتێک هەواڵی وەفاتی گەیشت بە عمر بن عبدالعزيز وتی : (والله ئەمە بۆشايی و فەراغێکە لە ئیسلام).

واتا بە وەفاتکردنی بۆشايی و فەراغێک دروست بووە لە ئیسلامدا، ئەمەش نیشانەی زۆری زانستی بووە رحمة الله .

## دەربارەی سُلَيمان بن يَسَار

- سُلَيمان بن يَسَار، ساڵی (١٠٧ ھ) وەفاتی کردووە، مەولای دایکی ئیمانداران ميمونة بووە رضي الله عنها، هەندێک لە زانایان لە زانستدا پێشیان خستووە بەسەر سعيد بن المسيب دا، یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە .

- مالك بن أنس ئەڵێت : (سليمان بن يسار لە زانایان بوو پاش سعيد بن المسيب، وە زۆر موافەقەی سعيد ی ئەکرد) .

## دەربارەی أبَان بن عُثمان

- أبَان بن عُثمان، ساڵی (١٠٥ هـ) وەفاتی کردووە، کوڕی هاوەڵی بەڕێز عثمان بن عفان ـ رضي الله عنه .

- مالک بن أنس ئەڵێت : (عبدالله بن أبي بكر پێی وتم کە باوکی أبو بکر بن حزم قەزاوەت لە أبان ـەوە فێرئەبوو) .

أبو بكر بن محمد بن عمرو بن حزم لە سەردەمی ئەمەویەکاندا قازی بووە، ئەمەش نیشانەی زانستی أبان ـ رحمه الله .

## دەربارەی عُبَیدُالله بن عَبدِالله بن عُتبَة بن مَسعود

- عُبَیدُالله بن عَبدِالله بن عُتبة بن مَسعود، ساڵی (٩٨ هـ) وەفاتی کردووە، یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە .

- الزهري ئەڵێت : (یەکێک بوو کە دەریاکانی زانست) .

لەگەڵ ئەوەی زانا بووە لە فەرمووده و فیقهـدا، شاعیریش بووە، وە مؤدب ی عمر بن عبدالعزیز بووە .

## دەربارەی القاسِم بن مُحَمّد

- القاسِم بن مُحَمَّد، ساڵی (١٠٦ ھ) وەفاتی کردووە، نەوەی پێشەوای ئیمانداران أبو بكر الصديق، یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە .

- يحيي بن سعيد الأنصاري ئەڵێت : (لە مەدینە نەگەیشتین بە کەسێک فەزڵی بدەین بەسەر القاسم بن محمد دا) .

## دەربارەی سالِم بن عَبدالله

- سالِم بن عَبدالله، ساڵی (١٠٦ ھ) وەفاتی کردووە، کوڕی عبدالله بن عمر بن الخطاب ـە رضي الله عنهم .

- أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه ئەڵێن : (لە صحيح ترین سەنەدەکان بریتیە لە الزهري عن سالم عن إبن عمر) .

## دەربارەی أبو بكر بن عبدالرّحمن

- أبو بكر بن عبدالرَّحمن، ساڵی (٩٤ ھ) وەفاتی کردووە، چاوەکانی نابینا بوون، یەکێکە لە حەوت فەقیهە بەناوبانگەکەی مەدینە، ئەوەندە خەریکی عیبادەتکردن بووە پێیان وتووە ڕاهیبەکەی قورەیش .

## دەربارەی أبو سَلَمَة بن عبدالرّحمن بن عوف

- أبو سَلَمَة بن عبدالرَّحمن، كوڕی هاوەڵی بەڕێز عبدالرحمن بن عوف .

- الزهري ئەڵێت : (چوار كەسم بینی وەكو دەریا وابوون : عروة بن الزبیر، وە ابن المسیب، وە أبو سلمة، وە عبیدالله بن عبدالله) .

## دەربارەی طَلحة بن عبدالله بن عَوف

- طَلحة بن عبدالله بن عَوف، ساڵی (**٩٧** هـ) وەفاتی كردووە، باوكی برای عبدالرحمن بن عوف ە .

- إبن أبي خيثمة ئەڵێت : (ئەو و خارجة بن زید بن ثابت لە كاتی خۆیاندا فتوایان ئەدا و خەڵكی لەسەر وتەیان كۆئەبوونەوە، وە میراتیان دابەش ئەكرد) .

## دەربارەی نافِع بن جُبَیر بن مُطعِم

- نافِع بن جُبَیر بن مُطعِم، ساڵی (**٩٩** هـ) وەفاتی كردووە، باوك و باپیری هاوەڵی رسول الله ﷺ بوون .

● **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[ ١ - ئەوانەی کە پێی گەیشتوون، وە پێگەیشتنیان لەلامان جێگیر بووە بریتین لە :

سَعِيد بن المُسَيّب

وە عُروة بن الزُّبَير

وە قَبيصَة بن ذُؤَيب

وە خارجَة بن زَيد

وە سُلَيمان بن يَسَار

وە أبَان بن عُثمان .

وە لەلامان جێگیر نەبووە ئەوانی دیکە - فەرمووده و ئاثاریان - بیستبێت لە زید ئەوەندەی کە پێمان گەیشتووە، بەڵکو هەمان مەزهەبی ئەویان هەبوو لە فیقهو زانستدا .

٢ - لە پاش ئەوان لە مەدینە هیچ کەسێک نەبوو شارەزاتر بێت دەربارەیان لە :

إبن شِهاب

وە يَحيَى بن سَعيد

وە أبي الزِّنَاد

وه بُكَير بن عبدالله بن الأشَجّ

وه أبو بَكر إبن حَزم .

٣ - له پاش ئەوانیش هیچ کەسێک هێندەی مالِک بن أنَس شارەزا نەبوو دەربارەی خۆیان و مەزهەبەکەیان .

- ئیمام له ئەثەرێکی تر ئەڵێت - له پاش ئەوان ئەو کەسانەی خاوەنی هەمان مەزهەب بوون بریتی بوون له :

مالِک بن أنَس

وه كَثير بن فَرقَد

وه المُغيرَة بن عَبدالرَّحمن المَخزُومي

وه عَبدالعزيز بن أبي سَلَمَة المَاجِشُون .

٤ - وه پاش مالک، عبدالرَّحمن بن مَهدي هەمان مەزهەبی ئەوانی هەبوو، وه شوێنی ئەوان ئەکەوت ] وتەی ئیمام تەواو بوو .

## • ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

١ - لێرەدا ئیمام ئاماژە بەوە ئەدات لەو دوانزە کەسەی باسی کردن کە خاوەنی مەزهەبی زَید بن ثابِت بوون رضي الله عنه و فتوایان بە فتواکانی داوە، تەنها شەش کەسیان گەیشتوون پێی و لێیەوە بیستوویانە، ئەوانەی تر لە کەسانی ترەوە زانست و فتواکانی زَید بن ثابِت رضي الله عنه یان وەرگرتووە .

## دەربارەی يحيى بن سعيد الأنصاري

٢ - یَحیی بن سَعید الأنصاري، ساڵی (١٤٣ هـ) وەفاتی کردووە، تەلەبەی هەر حەوت فەقیهەکەی مەدینە بووە .

ئەم ئیمامە بەڕێزە یەکەم فەرموودەی صحیح البخاري (إنما الأعمال بالنيات) ی ڕیوایەت کردووە، وە زیاد لە دووسەد کەس لەوەوە ڕیوایەتیان کردووە .

- سفيان الثوري ئەڵێت : (یَحیی بن سَعید الأنصاري لەلای ئەهلی مەدینە گەورەتر و بەڕێزتر بوو لە الزُهري) .

## دەربارەی أبو الزناد

- أبي الزناد، عبدالله الذكوان، ساڵی (١٣٠ هـ) وەفاتی کردووە، ئیمام و فەقیهـ و فەرموودەوان بووە .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (سفیان بن عیینة به أبا الزناد ی ئەوت أمیر المؤمنین له فەرمووده‌دا) .

- عبد ربه بن سعید وتی : (أبو الزناد چوویه مزگەوتی رسول الله ەوه ﷺ، وه هێندەی سوڵتانێک طالب علم ی لەگەڵدا بوو) .

واته وەک چۆن سوڵتان دەوروبەری قەرەباڵخ ئەبێت ئەگەر بێته ناو خەڵکی، أبو الزناد یش به هەمان شێوه طالب علم ی زۆری لەگەڵ بووه .

مالک بن أنس خاوەنی (الموطأ) ڕیوایەتی زۆری لێوه كردووه، وه یەكێكه له سەنەده هەره صحیح ەكانی .

## دەربارەی بُكَیر بن عبدالله بن الأشَجّ

- بُكَیر بن عبدالله بن الأشَجّ، ساڵی (١٢٧ ه) وەفاتی كردووه، ئیمام و ثقة و حافظ ە .

- إبن وهب ئەڵێت : (مالک بن أنس هەر كاتێک باسی بُكَیر ی كردبێت ئیللا وتوویەتی : له زانایان بوو) .

- معن بن عیسی ئەڵێت : (بۆ هیچ كەسێک نییه له فەرمووده‌دا فەزڵ بدات بەسەر بُكیر بن الأشَج دا) .

## دەربارەی أبو بکر بن محمد بن عَمرو بن حَزم

- أبو بكر بن محمد بن عَمرو بن حَزم، ساڵی (١٢٠ هـ) وەفاتی کردووە، ئەمیر و قازی مەدینە بووە .

- مالک بن أنس ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە وەکو إبن حزم بێت).

## دەربارەی کَثیر بن فَرقد

٣ - كَثير بن فَرقَد، ثقة ثبت، لە مصر نیشتەجێ بووە .

## دەربارەی المُغیرَة بن عَبدالرّحمن المَخزُومي

- المُغيرَة بن عَبدالرَّحمن المَخزُومي، ساڵی (١٨٦ هـ) وەفاتی کردووە، هارون الرشيد داوای لێکردووە قەزاوەتی مەدینە بگرێتە دەست نەیکردووە .

- الزبیر بن بکار ئەڵێت : (پاش مالک ئەو فەقیهی مەدینە بوو) .

## دەربارەی عَبدالعزیز بن أبي سَلَمَة المَاجِشُون

- عَبدالعزيز بن أبي سَلَمَة المَاجِشُون، ساڵی (١٦٤ هـ)، سەرەتا قەدەری و ئەهلی کەلام بووە، پاشان الله تعالى هیدایەتی داوە و بووە بە فەقیهـ .

- إبن وهب ئەڵێت : (ساڵی ١٤٨ ﻫ حەجم کرد، هاوارکەرێک هاواری ئەکرد : هیچ کەسێک فتوا بۆ خەڵکی نادات تەنها مالک و عبدالعزیز بن أبي سلمة نەبن) .

لەم بەشەدا باسی الزهري و مالک بن أنس و عبدالرحمن بن مهدي مان نەکردووە، چونکە لە کتێبەکەی تردا باسیان ئەکەین إن شاء الله .

• **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[ ١ - گوێم لێبوو يَحيى بن سَعيد القَطان وتی : (ئەوانەی کە ڕیوایەتیان کردووە لە زَيد بن ثابِت لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بریتین لە :

- علي بن أبي طالب .
- وە سَعد بن أبي وَقاص .
- وە عبدالله بن عُمَر .
- وە أبو سعيد الخُدري .
- وە عبدالله بن عَبَّاس .
- وە أنَس بن مالِک .

٢ - وە أبو سَلَمَة ڕیوایەتی لێوە کردووە - واتە لە زيد بن ثابت - لە نُفَيع مَولیَ أُم سَلَمَة .

٣ - وتم بە يَحيى القّطان : ئەی بُسر بن سَعيد ؟

وتی : چییەتی ؟

وتم : لە مَولی السُّفّاح لە زَيد بن ثابِت ـەوە ڕیوایەتی کردووە .

وتی : خۆ شَقیق لە عَبداللە وە ڕیوایەتی کردووە، وە لە پیاوێک لە عَبداللە ـشەوە ڕیوایەتی کردووە ] وتەی ئیمام تەواو بوو .

## ● ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

١ - لە ئەثەرەکانی پێشتردا ئیمام باسی تەلەبەکان و هاوەڵەکانی زَید بن ثابِت ی کرد رضي الله عنه .

پاشان لێرەدا ئیمام وتەی شێخەکەی ئەگێڕێتەوە کە نیشانەی زانایی و گەورەیی زَید بن ثابِت ـە لەناو هاوەڵاندا رضي الله عنهم .

چونکە هێندە زانا بووە هاوەڵانیش رضي الله عنهم بێپێویست نەبوون لە زانستەکەی چجای تابیعیەکان، وە چوار لەو هاوەڵانەی کە ڕیوایەتی زۆریان کردووە، ڕیوایەتیان لە زَید بن ثابِت ـەوە کردووە رضي الله عنهم، هەر لەبەر ئەو زانستە زۆرەیەتی کاتێک پێشەوای ئیمانداران أبو بكر الصديق رضي الله عنه ویستی قورئان لەناو یەک موسحەفدا کۆبکاتەوە، بە زَید بن ثابِت ی وت و ئەرکەکەی بە ئەو سپارد .

وە عبداللە بن عباس لە کاتی ناشتنی زَید بن ثابِت ـدا ئەفەرموویێت : (ئەمڕۆ زانستێکی زۆر خرایە ژێر خاکەوە)، رضي الله عنهم .

٢ - لەم وتەیە و وتەکەی دواتردا إن شاء الله فێری بابەتێک ئەبین بەناوی (چۆن بزانین ڕاویەک فەرموودەی بیستووە لەو ڕاویەی کە ڕیوایەتی لێ ئەکات ؟).

ئیمام ئەڵێت : [أبو سَلَمَة ڕیوایەتی لێوە کردووە لە نُفَیع مَولیَ أُم سَلَمَة] .

لە وتەکانی پێشوویدا ئیمام باسی ئەوەی کرد کە أبو سَلَمَة لەسەر مەزهەبی زَید بن ثابِت بووە و ڕیوایەتی لێوە کردووە، پاشان ناوی ئەو هاوەڵانەی هێنا کە ڕاستەوخۆ فەرموودەیان بیستبوو لە زَید بن ثابِت، بەڵام ناوی أبو سَلَمَة ی نەهێنا.

کەواتە لەلای ئیمام، أبو سَلَمَة فەرموودەی لە زَید بن ثابِت ـەوە نەبیستووە، چۆن ئیمام ئەمەی زانی ؟

وەڵامەکەی لە وتەکەیدایەتی، [أبو سَلَمَة ڕیوایەتی لێوە کردووە لە نُفَیع مَولیَ أُم سَلَمَة] .

واتە ئیمام تەماشای ڕیوایەتەکانی أبو سَلَمَة ی کردووە لە زَید بن ثابِت، تەماشا ئەکات ڕاستەوخۆ ڕیوایەتی لێوە نەکردووە، بەڵکو لە هەموو ڕیوایەتەکاندا و واسیتەیەک هەیە لە نێوانیاندا، ئەویش نُفَیع مَولیَ أُم سَلَمَة یە.

کەواتە هەرکاتێک ویستت بزانیت ڕاویەک فەرموودەی بیستووە لە ڕاویەکی ترەوە، ئەوە ئەچیت هەموو ڕیوایەتەکانی لەو ڕاویە دیاریکراوە کۆ ئەکەیتەوە، جا ئەگەر لە هەموو ڕیوایەتەکاندا لە نێوانیاندا واسیتەیەک هەبوو ئەوە ڕاویەکە ڕاستەوخۆ فەرموودەی لە شێخەکەیەوە نەبیستووە .

٣ - لێرەدا ئیمام کە ئەڵێت [لە مَولی السُّفّاح لە زَید بن ثابِت ـەوە ڕیوایەتی کردووە] مەبەستی ئەوەیە مادەم بُسر بن سعید بە واسیتەیەک ڕیوایەتی لە زید بن ثابِت کردووە، کەواتە فەرموودەی نەبیستووە لە زَید ـەوە .

بەڵام شێخەكەی ئیمام ئەڵێت [خۆ شَقیق لە عَبدالله وە ڕیوایەتی كردووە، وە لە پیاوێك لە عَبدالله شەوە ڕیوایەتی كردووە] .

واتە شَقیق بن سَلَمة لە هەندێك ڕوایەتدا ڕاستەوخۆ لە عبدالله بن مسعود ەوە فەرموودە ئەگێڕێتەوە .

وە لە هەندێك ڕیوایەتیشدا بە واسیتەی كەسێك لە عبدالله بن مسعود فەرموودە ئەگێڕێتەوە .

كەواتە شەرت نییە هەركاتێك بینیت ڕاویەك بە واسیتەی ڕاویەكی تر فەرموودەی لە شێخێك گێڕاوەتەوە ڕاستەوخۆ بڵێیت ڕاستەوخۆ فەرموودەی لێوە نەبیستووە .

بەڵكو ئەبێت هەموو فەرموودەكانی ئەو ڕاویە كۆ بكەیتەوە لە ڕاویەكەی دیكەوە، بۆ نمونە شقیق بن سلمة لە عبدالله بن مسعود، تەماشا ئەكەیت لە هەندێك ڕیوایەتدا ڕاستەوخۆ فەرموودەی لێوە ئەگێڕێتەوە .

وە لە هەندێك ڕیوایەتدا بە واسیتەی كەسێك لێوەی ئەگێڕێتەوە .

كەواتە شقیق فەرموودەی بیستووە لە عبدالله بن مسعود .

ئەم قاعیدەیە بەكاردێت بۆ ئەو ڕاویانەی كە مودەلیس نین، واتە ڕاوی لە سەنەدی فەرموودەكەدا لانابەن، ئەگەر هەمان بارودۆخی خاڵی سێیەم هەبێت و ڕاویەكە مودەلیس بێت ئەوە ڕیوایەتی (شقیق عن عبدالله) بە مُتَصل حساب نییە، چونكە ئەكرێت ڕاویەكی لە فەرموودەكەدا پەڕاندبێت، لە حاڵەتێكی لەم جۆرەدا ئەبێت ڕاویە مودەلیسەكە یەكێك صیغەكانی سَماع بەكار بهێنێت، واتە بڵێت (حَدَثني / أخبَرَني عبدالله بن مسعود) ئەوكاتە بۆمان دەرئەكەوێت كە ڕاویەكە ڕاستەوخۆ فەرموودەی بیستووە لە عبدالله بن مسعود رضي الله عنه .

● **الإمام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[قَيس بن إبي حازِم سَماع ی هەیە لە : أبي بَكر، وە عُمَر، وە عُثمان، وە عَلي، وە سَعد بن أبي وَقاص، وە زُبَير، وە طَلحة بن عُبَيدالله، وە أبي شَهم، وە جَرير بن عبدالله البَجَلي، وە أبي مَسعود البَدري، وە خَباب بن الأرَت، وە المُغِيرة بن شُعبة، وە مِرداس بن مالِک الأسلَمي، وە المُستَورد بن شَداد الفِهري، وە دُكَين بن سَعد المُزَني، وە مُعاوية بن أبي سُفيان، وە عَمرو بن العاص، وە أبي سُفيان بن حَرب، وە خالِد بن الوليد، وە حُذَيفة بن اليَمان، وە عبدالله بن مَسعود، وە سَعيد بن زَيد، وە أبي جُحَيفة .

وە ڕیوایەتی کردووە لە أبي هُريرة و قَيس بن قَهد .

وە ڕیوایەتی کردووە لە بِلال، بەڵام پێی نەگەیشتووە .

وە قيس بن أبي حازم سَماع ی نییە لە أبي الدَرداء و سَلمان] وتەی ئیمام تەواو بوو .

● **ڕوونکردنەوەو زانیاری زیاتر :**

قَيس بن أبي حازِم (٩٧ ھ) تابیعیەکی مُخَضرَم ە، ئیمانی بە رسول الله ﷺ هێناوە، کاتێک رسول الله ﷺ وەفاتی کردووە قَیس لە ڕێگادا بووە بۆ بینینی، بەڵام نەگەیشتووە پێی، أبي حازِم ی باوکی هاوەڵی رسول الله یە ﷺ .

یەکێکە لەو تابیعیانەی کە بەشێکی زۆری هاوەڵانی بینیوە و ڕیوایەتی لێوە کردوون، بە جۆرێک کە ڕیوایەتی لە نۆ دانە لە دە مژدەپێدراوەکەی بەهەشت

کردووە، لە مژدەپێدراوەکاندا تەنها ڕیوایەتی لە عبدالرحمن بن عَوف نەکردووە رضي الله عنهم .

وە موجاهید بووە لە لەشکری خالِد بن الوَليد رضي الله عنه جیهادی کردووە .

وە وتەی ئیمام [سَماع ی نییە لە فلأنە کەسەوە] واتە فەرموودەی لێیەوە نەبیستووە .

- أبو داود السجستاني ئەڵێت : (قَيس لە تابیعیەکاندا خاوەنی باشترین سەنەدە) .

- يحيى بن معين ئەڵێت : (قَيس بن أبي حازِم متمانەپێکراوترە لە الزُهري و السائِب بن يزيد) .

هەریەک لە أبو إسحاق السَبيعي (**١٢٩** هـ)، وە إسماعيل بن أبي خالِد (**١٢٤** هـ)، وە الأعمَش (**١٤٨** هـ)، وە مُجالِد بن سَعيد (**١٤٤** هـ)، وە الحَكَم بن عُتَيبة (**١١٥** هـ) و زۆری دیکە ڕیوایەتیان لێوە کردووە .

لە نێوان هاوەڵانیدا إسماعيل بن أبي خالِد ڕیوایەتی زۆری لێوە کردووە .

إسماعيل بن أبي خالِد جێگیرترین کەسە لە الشَعبي دا .

• **الإِمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[ ١ - الحَسَن البَصري کاتێک منداڵ بووە گوێی لە عُثمان بن عَفان بووە وتاری داوە، وە سَماع ی هەیە لە عُثمان بن أبي العاص .

٢ - وە هیچی نەبیستووە لە عِمران بن حُصَين، سَماع ی الحَسَن لە عِمران بن حُصَين جێگیر نەبووە بە ڕێگەیەکی صحیح ی جێگیر .

٣ - وە الحَسَن سَماع ی نییە لە إبن عباس، وە هەرگیز نەیبینیوە، ئەو کاتەی الحَسن لە مەدینە بوو إبن عباس لە بەصرە بوو .

وە وتەی الحَسَن (إبن عباس وتاری بۆ داین لە بەصرە . . . ) .

وەکو وتەی ثابِت وایە : عِمران بن حُصَين هات بۆ لامان .

وە وەکو وتەی مُجاهِد : عَلي هات بۆ لامان .

وە وەکو وتەی الحَسَن : سُراقة بن مالِک بن جُعشُم بۆی گێڕاونەتەوە .

٤ - حَبِيب بن الشَّهِيد وتی : محمد بن سِيرين داوای لێ کردم پرسیار لە الحَسَن بکەم کە لە کێ فەرموودەی العَقِيقَة ی لەسەر بیستووە ؟

منیش پرسیارم لێ کرد .

وتی : لە سَمُرَة بیستم .

٥ - الحَسَن أُمَّ السَلَمَة ی بینیوە، بەڵام سَماع ی لێوە نییە چونکە منداڵ بووە، وە دایکی الحَسَن خزمەتی أُمَّ السَلَمَة ی ئەکرد، وە لێیەوە گێڕاویەتیەوە .

٦ - الحَسَن سَماع ی نییە لە أبي مُوسى الأشعَري .

٧ - سَماع ی هەیە لە جُندُب بن عبدالله .

٨ - وە سَماع ی نییە لە عبدالله بن عَمرو و عَمرو بن تَغلِب .

٩ - وە سَماع ی هەیە لە إبن عُمَر .

١٠ - وە هیچی گوێ لێ نەبووە لە أبي بَرزة الأسلَمي، وە هیچی نەبیستووە لە أُسامة بن زَید .

١١ - وە هیچی نەبیستووە لە عُقبة بن عامِر .

١٢ - وە هیچی نەبیستووە لە أبي ثَعلَبة الخُشَني .

١٣ - وە هیچی نەبیستووە لە أبي هُرَيرة الدَّوسي .

١٤ - وە هیچی نەبیستووە لە أبي سَعید الخُدري .

١٥ - وە هیچی نەبیستووە لە جابِر بن عبدالله رضي الله عنهم ] وتەی ئیمام تەواو بوو .

## ● ڕوونکردنەوەو زانیاری زیاتر :

الحَسَن البَصري (٢١ - ١١٠ ﮪ) رحمه الله یەکێکە لەو تابیعیانەی لە چەند بوارێکدا شارەزا بووە، وە محمد بن سعد لە کتێبی (الطبقات) بەم جۆرە وەسفی ئەکات : (کان الحَسَن رحمه الله جامعاً، عالماً، رفیعاً، فقیهاً، ثِقةً، حُجةً، مَأمونا، عابِداً، ناسِکاً، کَثیر العِلم، فَصیحاً، جَمیلا، وسیماً).

ئیمام بۆمان باس ئەکات کە الحَسَن سَماع ی لە کێ هەیە، واتە فەرموودەی لە کێ وە بیستووە، وە سَماع ی لە کێ نییە .

ئەم بابەتە گرنگە بۆ دیاریکردنی (إتِصال یان إنقِطاع) ی سەنەد .

بۆ نمونە ئەگەر سەنەدێکت بینیت الحَسَن ڕیوایەت لە هاوەڵێکەوە ئەکات کە ئیمام لێرەدا ئەڵێت سَماع ی لێوە نییە، ئەوە ڕاستەوخۆ ئەتوانێت بڵێیت سەنەدەکە مُنقَطِع واتە پچڕاوە .

١ - پرسیار لە أبو زرعة ئەکەن : ئایا الحَسَن گەیشتووە بە هیچ کەسێک لە بەدریەکان ؟

وتی : (تەنها بینیونی، عُثمان بن عَفان و عَلي بینیوە) .

پێی وترا : فەرموودەی لێیانەوە بیستووە ؟

وتی : (نەخێر) .

٢ - لێرەدا ئیمام ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ ئەدات، ئەڵێت [سَماع ی الحَسَن لە عِمران بن حُصَین جێگیر نەبووە بە ڕێگەیەکی صحیح ی جێگیر] .

ئەم قسەیەی ئیمام واتە : الحَسَن کە فەرموودە ئەگێڕێتەوە لە عِمران بن حُصَین یان نێوەندێکیان لە نێواندایە، یاخود بە صیغەی مُحتَمَل ڕیوایەت ئەکات .

وە ئەگەر لە هەندێ شوێندا الحَسَن بە صیغەی سَماع ڕیوایەتی کردبێت لە عِمران بن حُصَین ئەوە وەهم و هەڵەیە لە تەلەبەکانی الحَسَن ـەوە .

واتە بۆ نمونە هاوەڵە جێگیرەکانی الحَسَن بەم صیغەیە فەرموودەکانی الحَسَن ڕیوایەت ئەکەن :

- الحَسَن عن عِمران بن حُصَین .

- الحَسَن عن رَجلٍ عن عِمران بن حُصَین .

پاشان تەلەبەیەکی ضعیف ی الحَسَن دێت بەم صیغەیە فەرموودەکانی الحَسَن ڕیوایەت ئەکات :

- قال الحَسَن (حَدَّثَني، حَدَّثَنا . . . ) عِمران بن حُصَین .

جا لێرەدا لەبەر ئەوەی لە ڕیوایەتی هاوەڵە جێگیرەکانی الحَسَن سَماع ی جێگیر نەبووە لە عِمران بن حُصَین، ئەگەر لە ڕیوایەتی هاوەڵێکی ضَعیف یدا سَماع ی الحَسَن جێگیریش بێت لە عِمران بن حُصَین ئەوە حسابی بۆ ناکرێت .

هەربۆیە کە لە یحیى بن سعید القَطان ئەپرسن ئەڵێن : ئایا الحَسَن ئەیوت سَمِعتُ عِمران بن حُصَین ؟

وتی : (لە ثِقة یەکەوە نەخێر) .

واتە ڕیوایەت هەیە الحسن بلّێت سَمِعتُ عِمران بن حُصَین، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕاویەکە ثِقة و جێگیر نییە و دژی ڕیوایەتی هاوەڵە جێگیرەکانیەتی حسابی بۆ ناکرێت .

٣ - لێرەدا ئیمام ئاماژە بە شتێک ئەکات لەوانەیە تا ئێستا نەمانبیستبێت ، لە پێشدا وتی کە [الحَسَن سَماع ی نییە لە إبن عباس، وە هەرگیز نەیبینیوە]، وە پاشان ئەڵێت [وە وتەی الحَسَن (إبن عباس وتاری بۆ داین لە بەصرە . . . ) .

وەکو وتەی ثابِت وایە : عِمران بن حُصَین هات بۆ لامان] .

لێرەدا الحَسَن مەبەستی ئەوەیە إبن عباس رضي الله عنه وتاری بۆ خەڵکی بەصرە داوە، وە کاتێک الحَسَن ئەڵێت (إبن عباس وتاری بۆ داین) مەبەستی خۆی نییە، بەڵکو مەبەستی خەڵکی بەصرەیە .

وە چۆن ثابِت ئەڵێت [عِمران بن حُصَین هات بۆ لامان] واتە هات بۆ بەصرە بۆ لامان، چونکە ثابِت بەصریە .

٤ - لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە الحَسَن سَماع ی هەیە لە سَمُرَة بن جُندُب رضي الله عنه، چونکە الحَسَن ئەڵێت فەرمووده‌کەم لەو بیستووە .

**٥** - أُمَّ السَلَمَة دایکی ئیمانداران رضي الله عنه، وە ئەزانین الحَسَن سَماع ی نییه لە أُمَّ السَلَمَة بە بەڵگەی ئەوەی لە هەموو ڕیوایەتەکاندا بە واسیتەی دایکی ڕیوایەتی لێوە ئەکات، واتە (الحَسَن عن أُمه عن أُمَّ السَلَمَة رضي الله عنها).

وە ئەگەر واسیتەیەکیشیان لە نێواندا نەبووبێت ئەوە بە صیغەی مُحتَمَل گێڕاویەیتەوە نەک بە صیغەی سَماع، واتە بەم جۆرە (الحَسَن عن أُمَّ السَلَمَة رضي الله عنها) .

● **الإِمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[ ١ - شُعبة ئەڵێت : (فەرموودەكانی محمد بن سيرين - له إبن عباس -، له عِكرمة ی بیستووه، له سەردەمی المُختار دا پێی گەیشت، وه إبن سيرين هيچ شتێكی نەبیستووه له إبن عَبَّاس ـەوه) .

٢ - (هيچ يەكێك له هاوەڵانی عبدالله بن مَسعود له هيچ شتێكدا پێشناخەم بەسەر مَسروق دا .

الشَعبي ئەڵێت : هيچ كەسێكم نەبينيوه هێندەی مَسروق طەلەبی عيلم بكات) .

٣ - إبن المديني ئەڵێت : (القاسِم بن عبدالرحمن له هاوەڵانی رسول الله ﷺ تەنها گەیشتووه به جابر بن سمرة .

پێی وترا : ئايا گەیشتووه به إبن عمر ؟

وتی : دوو فەرموودەی له إبن عمر ـەوه گێڕاوەتەوه، بەڵام هيچی نەبیستووه له إبن عمر) .

٤ - (سالِم بن أبي الجَعد گەیشتووە بە کۆمەڵێک لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، گەیشتووە بە جابر بن عبدالله، وە عبدالله بن عمرو، وە إبن عمر، وە النُعمان بن بَشير .

وە أنس بن مالک و سلمة بن نُعَيم و نُبيط بن شَريط ی بینیوە).

٥ - (هِشام عن الحَسَن بە گشتی لە حَوشَب ـەوەیە، بەڵام فەرموودەکانی لە محمد ـەوە صحيح ـن).

٦ - (هیچ کەسانێک هێندەی أيوب السَختياني و إبن عَون جێگیر نین لە محمد بن سيرين ئەگەر یەکدەنگ بوون .

وترا : ئەی ئەگەر ڕاجیاواز بوون ؟

وتی : أيوب جێگیرترە .

وە هِشام الدستوائي جێگیرترە لە خالد الحَذاء لە إبن سيرين، وە هەردووکیان جێگیرن .

وە يونس بن عُبَيد جێگیرترە لە إبن عَون لە الحَسَن البَصري ـدا)] وتەی ئیمام تەواو بوو .

● ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

## دەربارەی محمد بن سيرين

١ - محمد بن سيرين (٣٢ - ١١٠ ھ) ئیمامێکی تابیعیە، باوکی مەولای أنس بن مالک بووە رضي الله عنه .

- إبن عَون (١٥٠ ھ) دەربارەی ئەڵێت : (محمد فەرموودەکانی پیت بە پیت ئەگێڕایەوە)، واتە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا زۆر ئاگادار بووە و گرنگی داوە بەوەی فەرموودەکانی وەکو خۆی بگێڕێتەوە .

وە ئیمامی أحمد لەم بابەتەدا هاوڕای ئیمام إبن المَديني يە و لە کتێبی (المَراسيل) ی إبن أبي حاتم دا لێوەی ڕیوایەت کراوە کە ئەڵێت : (محمد بن سيرين سَماع ی نییە لە إبن عباس، لە هەموو ڕیوایەتەکاندا ئەیوت ' نُبِّئتُ عن إبن عباس : هەواڵم پێدرا لە إبن عباس ەوە ' ) .

## دەربارەی القاسم بن عبدالرحمن المسعودي

٣ - القاسم بن عبدالرحمن بن عبدالله بن مَسعود المَسعودي (١١٦ ھ) .

- إبن مَعين دەربارەی ئەڵێت : (ثِقة ) .

- العِجلي دەربارەی ئەڵێت : (قازی کوفە بوو، وە لەسەر قازیەتی پاداشتی وەرنەئەگرت - واتە مەعاشی قازیەتی وەرنەئەگرت والله أعلم -، وە پیاوێکی بۆخواسوڵحاوی ثِقة بوو) .

- إبن عيينة ئەڵێت وتم بە مسعر : (کێ جێگیرترین کەسە کە پێی گەیشتبێتیت ؟.

وتی : القاسم بن عبدالرحمن و عمرو بن دينار) .

ئیمام ئەڵێت [دوو فەرموودەی لە إبن عمر ـەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام هیچی نەبیستووە لە إبن عمر]، چونکە القاسم فەرموودەکانی بە صیغەی مُحتَمَل گێڕاوەتەوە .

لە یەکەم فەرموودەیاندا کە لە (المصنف إبن أبي شيبة : ٢/١٤٠) هاتووە ئەڵێت (عن عبدالله بن عمر) .

وە لە دووەم فەرموودەشدا لە (العلل لإبن أبي حاتم) دا ئەڵێت : (أن عبدالله بن عمر) .

## دەربارەی سالم بن أبي الجَعد

٤ - سالم بن أبي الجَعد (١٠٠ ھ) یەکێکە لە تابیعیە ثقة کان .

البُخاري لە (العلل الكبير لـ التِرمذي) دا ئەڵێت : (سَماع ی هەیە لە جابِر بن عبدالله و أنس بن مالک) .

٥ - هِشام بن حسان (١٤٥ ھ)، وتەی ئیمام [هِشام عن الحَسَن بە گشتی لە حَوشَب ـەوەیە] واتە ئەو فەرموودەیانەی هِشام لە الحَسَن البَصري ـەوە بە صیغەی مُحتَمَل ی عن گێڕاویەتیەوە ڕاستەوخۆ لە الحَسَن ـەوە نییە، بەڵکو لە

حَوشَب ـەوەیە، بەڵام هِشام تدلیس ی کردووە و حَوشَب ی لە سەنەدەکەدا لابردووە .

جَرير بن حازم موافەقەی ئیمام ئەکات، لە (شَرح عِلَل التِرمذي) هاتووە کە علي بن المديني ئەڵێت : (گوێم لە عرعرة بن البرند بوو وتی عباد بن منصور پێی وتم ' هەرگیز هِشام بن حسان م لەلای الحَسن نەبینیوە) .

وە ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە جرير بن حازم وتی : حەوت ساڵ لەگەڵ الحسن دانیشتم، هەرگیز لە هِشام م نەبینیوە لەلای .

وتم : ئەی أبا النَضر، لە الحَسن ـەوە ڕیوایەتی بۆ کردووین، وە ئێمەش لێیەوە ڕیوایەتمان کردووە، تۆ پێ وایە لە کێوە ڕیوایەتی کردبێت ؟

وتی : پێم وایە حَوشَب وەریگرتووە) .

ڕاستە هِشام لە بەصرە ژیاوە لە کاتی ژیانی الحَسَن البَصري دا، بەڵام لەبەر ئەوەی تەلەبە نزیکەکانی الحَسَن ئەڵێن هیچ کاتێک هِشام مان نەبینیوە لەلای الحَسَن کەواتە هِشام ڕیوایەتەکانی لە کەسێکی ترەوە لە الحَسَن بیستووە نەوەک لە خودی الحَسَن ـەوە .

## دەربارەی أیوب السَختیاني

٦ - (أيوب السَختياني (٦٦ - ١٣١ هـ) ئیمامێکی بەڕێزی تابیعیەکانە، تەلەبەی محمد بن سيرين و الحَسَن البَصري و مُجاهِد بن جَبر و نافع و قَتادة و عَطاء بن أبي رَباح و زۆری دیکە بووە .

وە مالک و شُعبة و سُفیان الثوري سُفیان بن عُیَینة و حَماد بن زَید و حَماد بن سَلَمة تەلەبەی بوون .

ئەگەر أیوب فەرموودەی بۆ محمد بن سیرین بگێڕایەتەوە، إبن سیرین ئەیوت : (ڕاستگۆکە هەواڵی پێدام) .

- هِشام بن عُروة ئەڵێت : (لە عێراقەوە هیچ کەسێک نەهات بۆلامان باشتر بێت لە أیوب السَختیاني) .

- شُعبة ئەڵێت : (أیوب هەواڵی پێدام، گەورەی فەقیهەکان) .

- محمد بن سَعد ئەڵێت : (أیوب لە فەرموودەدا ثِقة یەکی ثَبت بوو، کۆکەرەوە و خاوەن وەرع بوو، وە زانستی زۆر بوو) .

- النَسائي دەربارەی ئەڵێت : (ثِقة ثَبت) .

## دەربارەی عبدالله بن عَون بن أرطَبان

- عبدالله بن عَون بن أرطَبان (١٥٠ ھ)، ئیمامێکی تابیعیە، تەلەبەی محمد بن سیرین و الحَسَن البَصري و مُجاهِد بن جَبر و سَعید بن جُبَیر و مَکحول و إبراهیم النَخَعي و نافع و زۆر زانای دیکەی تابیعی بووە .

وە شُعبة و سُفیان الثَوري و یَزید بن هارون و إسماعیل بن عُلَیة و مُعاذ بن مَعاذ و عَباد بن عَوام و عبدالله بن المُبارک تەلەبەی بوون .

- عبدالله بن المُبارک ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە باشتر بێت لە إبن عَون) .

- محمد بن سَعد ئەڵێت : (إبن عَون ثِقة بوو، فەرموودەی زۆر بوو، وە خاوەن وەرع بوو) .

- خارجة بن مُصعَب ئەڵێت : (بیست و چوار ساڵ هاوەڵێتی إبن عَون م کرد، واناازانم مەلائیەکان یەک تاوانیشیان لەسەر نووسیبێت) .

- رَوح بن عبادة ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە خواپەرستتر بێت لە إبن عَون) .

- عبدالرحمن بن مَهدي ئەڵێت : (هیچ کەسێک لە عێراق هێندەی إبن عَون شارەزای سوننەت نەبوو) .

- عُثمان بن سَعید الدارمي ئەڵێت : پرسیارم کرد لە یحیی بن مَعین دەربارەی إبن عَون ؟

وتی : (لە هەموو شتێکدا ثِقة یە) .

## دەربارەی یونس بن عبید

- یونس بن عبید (١٤٠ ه) ئیمامێکی تابیعیە، تەلەبەی محمد بن سیرین و الحَسَن البَصري و عِکرمة و نافع و عَطاء بن أبي رَباح و زۆری دیکە بووە .

حَماد بن زَيد و حَماد بن سَلَمة و شُعبة و هُشَيم و يَزيد بن زُرَيع و مُعتَمر بن سُليمان و سُفيان الثَوري و زۆرێکی دیکە ڕیوایەتیان لێوە کردووە .

- أحمد بن حَنبَل و يحيي بن مَعين دەربارەی ئەڵێن : (ثِقة ) .

- محمد بن سَعد دەربارەی ئەڵێت : (ثِقة بوو، فەرموودەی زۆر بوو، وە هەرگیز هیچی نەئەنووسیەور ) .

واتە حِفظ ی زۆر باش بووە .

- هَشام بن حَسان ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی یونس بە زانست هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله بدات ) .

• **الإِمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[١ - (أبو عُثمان النُّهدي ناوى عَبدالرَّحمن بن مِل ـه، عەرەبە، وە گەیشتووە بە جاهیلیەت، لەپاش وەفاتی أبو بَكر هیجرەتی كردووە بۆ مەدینە .

سَماع ی هەیە لە عُمَر، وە ڕیوایەتی كردووە عَلي بن أبي طالِب، وە ڕیوایەتی كردووە لە سَعد بن مالِک، وە سَعيد بن زَيد، وە أُسامة بن زَيد، وە أبي بَكرة، وە أبي بَرزه الأسلَمي، وە أُبَي بن كَعب، مُشاجِع بن مَسعود، وە عَمرو بن العاص، وە عبدالله بن عَمرو بن العاص، وە إبن عُمر، وە إبن عَباس، وە إبن مَسعود، وە قَبيصَة بن مُخارق، وە زُهَير بن عَمرو، وە عبدالرحمن بن أبي بَكر، وە حُذَيفة، وە سَلمان الفارسي، وە أبي هُريرة، وە أبي سَعيد الخُدري، وە جابِر بن عبدالله، وە أبي موسى الأشعَري .

وە ڕیوایەتی كردووە لە عبدالله بن عامِر لە الزُبير ـەوە، وە لە مُطَرف بن عَوف لە أبي ذر ـەوە، وە سَماع ی نییە لە أبي ذَر) .

٢ - (وە عَطاء بن أبي رَباح گەیشتووە بە عبدالله بن عمر، وە أبو سعيد الخُدري ی بینیوە لە كاتی تەوافكردن بە دەوری كەعبەدا هیچی لێوە نەبیستووە، وە گەیشتووە بە جابِر و إبن عباس، وە عبدالله بن عَمرو ی بینیوە .

وە هیچی نەبیستووە لە زَيد بن خالد الجُهَني، وە لە أُم سَلَمة و أُم هانئ یشەوە .

سَماع ی هەیە لە عبدالله بن الزُبير و إبن عمر ـەوە .

وه هیچی نەبیستووه له أُم كُرز، بەڵكو لەڕێگەی أُم حبيب بنت مّيسَرة له أُم كُرز ڕیوایەتی كردووه .

وه سَماع ی هەیه له عائِشة و جابر بن عبدالله) .

٣ - (حَبيب بن أبي ثابِت گەیشتووه به إبن عباس، وه سَماع ی هەیه له عائِشة، وه جگه لەو دوانه سماع ی نییه له هیچ هاوەڵێكی تری رسول الله ﷺ).

٤ - (له هاوەڵانی ثابِت دا كەسیان تێدا نەبوو جێگیرتر بێت له حَمَّاد بن سَلَمة، وه دوای ئەو سُلَيمان بن المُغيرة، وه پاش ئەو حَمَّاد بن زَيد .

بەڵام جَعفر فەرموودەی زۆری گێڕایەوه له ثابِت، وه مەراسیلەكانی نووسیەوه و تێیدا فەرموودەی مُنكَر هەبوو .

وه له فەرموودەكانی مَعمَر عن ثابِت فەرموودەی غَريب و مُنكَر ی تێدایه).

٥ - (سالم بن أبي الجَعد نەگەیشتووه به إبن مَسعود) .

٦ - (وه طاوس هیچی نەبیستووه له مُعاذ بن جَبَل)] وتەی ئیمام تەواو بوو.

● ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

## دەربارەی أبو عُثمان النّهدي

١ - أبو عُثمان النهدي لە تابیعیە مُخَضرَم ـەمەکانە، ساڵی (١٠٠ ھ) لە تەمەنی ١٣٠ ساڵیدا وەفاتی کردووە، ڕیوایەتی کردووە لە زۆرێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان رضي الله عنهم، هەرسێ ئیمامی علي بن المديني و أبو زُرعة و أبو حاتم الرازي بە ثِقة دایانناوە .

لە ژیانیدا ٢ حەجی لە جاهیلیەتدا کردووە، وە ٦٠ حەجی لە ئیسلامدا کردووە .

ئیمامێکی موجاهید بووە، وە بەشداری لە زۆر غەزادا کردووە، وەکو غەزاکانی اليرموك و القادسية و جلاولاء و تستر و نهروان و مهران و رستم و أذربايىنجان و . . .

وە ٢٠ ساڵ هاوەڵێتی سلمان الفارسي کردووە رضي الله عنه .

- معتمر بن سليمان لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێت : (أبو عُثمان النُّهدي هیچ خەریکی دنیا نەبوو، شەو خەریکی شەونوێژ بوو، وە ڕۆژ ڕۆژووی ئەگرت، وە ئەوەندە نوێژی ئەکرد تا ئەبووڕایەوە) .

## دەربارەی عَطاء بن أبي رَباح

**٢** - دەربارەی سَماع ی عَطاء بن أبي رَباح لە إبن عمر ـەوە رضي الله عنه هەردوو ئیمام أحمد بن حنبل و یحیی بن معین رحمهم الله موخالەفەی ئیمام إبن المدیني یان کردووە رحمه الله و ئەڵێن عَطاء إبن عمر ی بینیوە بەڵام هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەبیستووە، واتە سَماع ی نییە لێیەوە .

عَطاء بن أبي رَباح لە سەردەمی خەلافەتی عثمان بن عفان رضي الله عنه ـدا لەدایک بووە، ناسراوە بە شێخ و موفتی حەرەم .

خۆی ئەڵێت گەیشتووم بە **٢٠٠** هاوەڵی رسول الله ﷺ .

سعید بن أبي الحسین لە دایکەوە ئەگێڕێتەوە کە ناردوویەتی تا پرسیار لە إبن عباس بکات ئەویش فەرموویەتی : (ئەی ئەهلی مەککە پرسیار لە من ئەکەن و عطاء تان لەناودایە!) .

ساڵی **١١٥** هـ وەفاتی کردووە .

## دەربارەی حَبیب بن أبي ثابِت

**٣** - حَبیب بن أبي ثابِت (**١١٩** هـ) موفتی کوفە بووە، الأعمَش و مَنصور و شُعبة و سفیان الثَوري و أبو الزُبیر و إبن جُریج و زۆرێکی دیکەی تەلەبەی بوون.

- یحیی بن سعید القَطان دەربارەی ئەڵێت : (ثِقةٌ حَجة) .

## دەربارەی ثابِت البُناني

٤ - ثابِت البُناني (١٢٧ ھ) یەکێکە لە تەلەبە هەرە نزیکەکانی هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالِک رضي الله عنه .

- حَمَّاد بن سَلَمة (٩١ - ١٦٧ ھ) .

## دەربارەی سُلَیمان بن المُغیرة

- سُلَیمان بن المُغیرة (١٦٥ ھ) .

- أحمد بن حنبل دەربارەی ئەڵێت : (ثَبتٌ ثَبت) .

- یحیي بن معین دەربارەی ئەڵێت : (ثِقةٌ ثِقة) .

- إبن سعد دەربارەی ئەڵێت (ثِقة یەکی ثَبت بوو) .

- أبو داود الطیالسي ئەڵێت : (لەلای شُعبة بووین سُلَیمان بن المُغیرة بە گریانەوە هات بۆلامان و وتی : (گوێدرێژەکەم مرداربوویەوە، وە جومعە و پێداویستیەکانیشم لەدەست چوو) .

شُعبة وتی : (بە چەند کڕیبووت ؟)

وتی : (سێ دینار) .

شُعبة وتی : (منیش سێ دینارم پێیە، سوێند بە الله بێجگە لەوە هیچی ترم پێ نییە) پاش ئەوە پارەکەی پێدا .

## دەربارەی حَمّاد بن زَيد

- حَمَّاد بن زَيد (**٩٨** - **١٧٩** ه) .

- عبدالرحمن بن مَهدي دەربارەی ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە لە حَمَّاد بن زَيد زاناتر بێت، نە سُفیان، نە مالِک) .

- يحيي بن معين دەربارەی ئەڵێت : (هیچ کەسێک نییە جێگیرتر بێت لە حَمَّاد بن زَيد) .

- يحيي بن يحيي النَيسابوري (**٢٢٦** ه) دەربارەی ئەڵێت : (هیچ شێخێکم نەبینیوە حافظ تر بێت لە حَمَّاد بن زَيد) .

- أحمد بن حنبل دەربارەی ئەڵێت : (حَمَّاد بن زَيد لە ئیمامەکانی موسوڵمانانە) .

هیچ شتێکی نەنوسیوەتەوە تەنها پشتی بە لەبەرکردن بەستووە .

وە دەربارەی جعفر بن سليمان الضبعي و معمر بن راشد لە ثابت ـەوە کە فەرمووەی مُنکَر یان هەیە واتە کۆمەڵە فەرموودەیەکیان بە شێوازێک

گێڕاوەتەوە کە هاوەڵە جێگیرەکانی ثابت بەو جۆرە نەیانگێڕاوەتەوە و موخالەفەیان کردوون .

● **الإمَام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[١ - أيّوب ساڵی (١٣١ هـ) وەفاتی کردووە، لە تاعون نەکەدا .

٢ - وە يونُس ساڵی (١٣٩ هـ) وەفاتی کردووە .

٣ - إبن عَون ساڵی (١٥٠ هـ) وەفاتی کردووە .

٤ - هِشام ساڵی (١٤٨ هـ) وەفاتی کردووە .

٥ - إبراهيم النَّخَعي ساڵی (٩٥ هـ) وەفاتی کردووە .

٦ - وە سعيد بن جُبَير ساڵی (٩٥ هـ) کوژرا، وە لەو ساڵەدا الحَجَّاج مرد .

٧ - هِشام بن سَعد ساڵی (١٦٠ هـ) وەفاتی کردووە .

٨ - أبو عَوانة ساڵی (١٧٥ هـ) وەفاتی کردووە .

٩ - بشر بن المُفَضَّل و محمد بن سَواء و فُضَيل بن عِياض و مُعتَمِر ساڵی (١٨٧ هـ) وەفاتيان کردووە .

١٠ - أبو مُعاوية ساڵی (١٩٥ هـ) مردووە .

١١ - إبن عمر پاش ١٣ ساڵ لە وەفاتکردنی مُعاوية وەفاتی کرد رضي الله عنهم .

١٢ - قَتادة ساڵی (١١٧ هـ) وەفاتی کردووە لە تەمەنی ٥٦ ساڵیدا .

**١٣** - مالِک لە تەمەنی **٨٤** ساڵیدا، لە ساڵی (**١٧٩** هـ) وەفاتی کردووە، وە أبو الأحوَص و حَمَّاد بن زَيد یش، مالِک ساڵی (**٩٥** هـ) لەدایک بووە .

**١٤** - طاوس ساڵی (**١٠٤** هـ) وەفاتی کردووە .

**١٥** - يزيد بن زُرَيع و سُفيان بن حَبيب ساڵی (**١٨٢** هـ) وەفاتیان کردووە .

**١٦** - الثَّوري ساڵی (**١٦١** هـ) وەفاتی کردووە .

**١٧** - وە شُعبة ساڵی (**١٦٠** هـ) وەفاتی کردووە .

**١٨** - يحيى بن زَكَرِيّا بن أبي زائدة (**١٨٢** هـ) وەفاتی کردووە .

**١٩** - وە حَمَّاد بن سَلَمَة ساڵی (**١٦٧** هـ) وەفاتی کردووە] وتەی ئیمام تەواو بوو .

● ڕوونكردنەوە و زانیاری زیاتر :

- مەبەست لە أيّوب، أيّوب السختياني يە، وە يونُس، يونُس بن عُبَيد ە، وە هِشام، هِشام بن عُروة يە .

- ئیمامی مُعاوية رضي الله عنه ساڵی (٦٠ ھ) وەفاتی كردووە .

## دەربارەی أبو الأحوَص

- يحيى بن مَعين و أبو زُرعة و النّسائي دەربارەی أبو الأحوَص ئەڵێن : (ثِقة).

- العِجلي دەربارەی ئەڵێت : (ثِقة بوو، ئەهلی سوننە و شوێنكەوتن بوو)

## دەربارەی سُفيان بن حَبيب

- أبو حاتم الرازي دەربارەی سُفيان بن حَبيب ئەڵێت : (ثِقة ە، زاناترین كەسە بە فەرموودەكانی سعيد بن أبي عروبة ) .

● **الإمام عَليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله** ئەڵێت :

[حَديثُ أَبِي هُريرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ : (إِذَا أَكَلَ أَحدُكُمْ ؛ فَلْيَأْكُل بِيَمِينِه) .

رَوَاهُ نُعمانُ بن رَاشِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَن سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَرَوَاهُ مَعمَرُ، عن الزُّهْرِيّ، عَن سَالِمٍ، عن أبيه .

ورَوَاهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ وصَالِحُ بنُ كَيْسَانَ عَنِ الزُّهْرِيّ، عَن أبي بكر بن عُبيد الله عَنِ ابْنِ عُمَرَ .

ورَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ، كَمَا رَوَاهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ .

وَرَواهُ جُوَيرِيَةُ عَن مَالِكٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَن أَبِي بَكْرِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ عَنِ ابنِ عُمَرَ.

حَدِيثُ النُّعْمَانِ؛ مُنكَرٌ ؛ لَم يُتَابِعهُ عَلَيْهِ أَحَدٌ.

وَحَدِيثُ مالكٍ ؛ كَحَدِيثِ جُويَرِيَةَ، قَدِيمٌ، وَكَانَ يُسنِدُهُ] وتەی ئیمام تەواو بوو .

● **ڕوونکردنەوەو زانیاری زیاتر :**

لەم بەشەی کتێبەکەدا ئیمام باسی چەند فەرموودەیەک ئەکات، وە باسی ڕێگاکانی گێڕانەوەی فەرموودەکە ئەکات، وە لە کۆتایشدا دەربارەی ڕێگاکانی فەرموودەکە حوکمی خۆی ئەدات .

جا ئێمەش لەم ڕێگەکەوە ئەتوانین فێر ببین تا بزانین زانایانی سەلەف رحمهم الله چۆن بڕیاریان داوە لەسەر ئەوەی کام ڕێگەی گێڕانەوەی فەرموودە صحیح ە ؟ وە کامە لاوازە ؟ وە بە چ پێوەرێک و چۆن ئەم کارەیان ئەنجام داوە ؟

لەم بەشەدا إن شاء الله وتەکانی ئیمام إبن المديني بە عەرەبی ئەهێنم لەبەر ئەوەی پێم وایە بە عەرەبیەکە باشتر لێی تێئەگەین .

پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتەکە شتێکی گرنگ هەیە ئەبێت بیزانین، ئەویش بریتیە لە (جَمع الطُرُق) واتە کۆکردنەوەی ڕێگاکانی گێڕانەوە فەرموودەیەک .

جَمع الطُرُق زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بزانیت کامە ڕێگەی (سەنەدی) فەرموودەکە صحیح ە، وە کامە ضعیف ە، وە کام ڕاوی شتێکی لە فەرموودەکە پەڕاندووە و نەیگێڕاوەتەوە، یان کام ڕاوی شتێکی زیادەی خستووەتە سەری فەرموودەکە و گێڕاویەتەوە، وە بۆ زۆر مەبەستی تریش .

ئەمەش نمونەیەک :

فەرموودەکەی سەرەوە لە الزهري ـەوە بە سێ ڕێگا گێڕدراوەتەوە :

یەکەم : الزهري عن سعيد بن المسيب عن أبي هريرة .

دووەم : الزهري عن سالم عن إبن عمر .

سێیەم : الزهري عن أبي بكر بن عبيدالله عن إبن عمر .

ئێمە چۆن بزانین کامە ڕێگا (سەنەدە) ڕاستەکەیە ؟ دێین تەماشا ئەکەین بزانین کێ لە الزهري ـەوە وە بە کام ڕێگا گێڕاویەتیەوە، وە پێگەی ئەو ڕاویە لە ڕیوایەت کردن لە الزهري ـەوە چۆنە ؟

## لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەکان :

- ڕێگای یەکەم :

نُعمان بن راشد بە ڕێگای یەکەم لە الزُهري گیڕاویەتیەوە، نعمان حِفظ ی هێندە باش نییە، بۆیە پلەی صَدوق ی پێدراوە، وە لە فەرموودەکانیدا وەهم ی هەیە، واتە هەڵە ئەکات لە گێڕانەوەی فەرموودەکاندا .

جا لەبەر ئەوەی ئاستی حِفظ ی باش نییە، وە خۆی بە تەنها لەو ڕێگەیەوە گێڕاویەتیەوە ئەوە ڕێگەی یەکەم هەڵەیە و ڕاست نییە، وە ئیمام خۆی ئەڵێت [حَدِيثُ النُّعْمَانِ؛ مُنكَرٌ ؛ لَم يُتَابِعَهُ عَلَيْهِ أَحَدٌ] واتە فەرموودەکەی نُعمان مونکەرە، هیچ کەسێک لەگەڵی نەیگێڕاوەتەوە، واتە هاوەڵە جێگیرەکانی الزُهري بەو سەنەدە ڕیوایەتیان نەکردووە .

- ڕێگای دووەم :

مَعمَر بن راشد بە ڕێگەی دووەم لە الزُهري گێڕاوتەوە، مَعمَر ثقة و ثبت ـە لە الزُهري .

- ڕێگای سێیەم :

مالک بن أنس و سُفيان بن عُيينة و صالح بن كَيسان كە هەرسێکیان ثِقة و ثَبت ـن بە ڕێگەی سێیەم گێڕاویانەتەوە .

ئەنجام :

کەواتە تەنها بە تەماشاکردنی ئەو ڕاویانەی کە لە الزُهري ـەوە گێڕاویانەتەوە، وە پاش زانینی حاڵیان لە ڕووی حِفظ و ضَبط ـەوە ئەتوانین بڵێین بە دڵنیاییەوە ڕێگەی سێیەم صحیح ـە .

وە ئیمام خۆی ئاماژەی بەوە دا کە ڕێگەی یەکەم مونکەرە، واتە ضعیف ـە .

ئێستا ڕێگەی دووەم ئەمێنێتەوە، ئایا صحیح ـە یان ضعیف ؟ لەبەر ئەوەی الزُهري شێخی زۆر بووە ئەکرێت هەمان فەرموودە لە دوو شێخی جیاوازەوە ببیستێت، وە هەر جارێک لە شێخێکیانەوە بیگێڕێتەوە، وە معمر یش لە الزهري ـدا ثقة و ثبت ـە، کەواتە ڕێگەی دووەمیش صحیح ـە .

● الإمام عليّ بن المديني رحمه الله تعالى :

[١ - حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ : (مَثل المُهَجِّرِ إلى الجُمُعَةِ) .

رَوَاهُ مَعْمَرُ، وأَصْحَابُ الزُّهْرِيِّ، عَنِ الْأَغَرِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

إِلَّا أَنَّ ابْنَ عُيَيْنَةَ، رَوَاهُ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَجَمِيعاً صَحِيحٌ .

٢ - حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ : (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ؛ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ) .

رَوَاهُ مَالِكٌ، وَابْنُ عَجْلَانَ، سَعِيدِ المَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الخُزَاعِيُّ .

وَرَواهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ؛ فَخَالَفَهُمَا، فَرَوَاهُ عَنْ سَعِيدٍ المَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَالحَدِيثُ عِنْدِي : حَدِيثُ مَالِكَ وابْنِ عَجْلَانَ، وَأَخْطَأَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ .

٣ - حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ : (أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ حُذَافَةَ، يَطُوْفُ بِمِنَى) .

رَوَاهُ صَالِحُ بْنُ أَبِي الأَخْضَرِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ المُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

وَرَوَاهُ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ مَسْعُودِ بْنِ الحَكَمُ، أَنَّ النَّبِي ﷺ بَعَثَ ابْنَ حذافَةَ.

وَالحَدِيثُ حَديثُ مَعْمَرٍ، وَحَديثُ صَالِحٍ غَلَطٌ .

٤ - حدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ : (كَانَ بَيْنَ خَالِدٍ، وَبَيْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، بَعْضُ مَا يَكُوْنُ بَيْنَ النَّاسِ) .

فَقَالَ : رَوَاهُ زَائِدَةُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَرَوَاهُ الْأَعْمَشِ، يُخَالِفُ عَاصِماً فِي إِسْنَادِهِ؛ فَرَوَاهُ عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَلَا يُحْفَظُ مِنْ حَدِيْثِ سُهَيْلٍ .

وَالأَعْمَسُ أَثْبَتُ فِي أَبِي صَالِحٍ مِنْ غَيْرِهِ] وتەی ئیمام تەواو بوو .

## ● ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر :

١ - فەرموودەی یەکەم بە دوو ڕێگا گێڕدراوەتەوە :

ڕێگای یەکەم : مَعمَر و هاوەڵانی الزُهري عن الزُهري عن الأغر عن أبي هُرَيرة

.

ڕێگای دووەم : سُفيان بن عُيَينة عن الزُهري عن سعيد بن المُسَيب عن أبي هُرَيرة.

### لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەکان :

- ڕێگای یەکەم :

مَعمَر لە الزُهري دا ثِقة یە، وە چەند هاوەڵێکی تری الزُهري کە دیار نییە کێن .

- ڕێگای دووەم :

سُفيان بن عُيَينة کە ثِقة و ثَبت ە .

ئەنجام :

هەردوو ڕێگاکە ڕاوی ثِقة ی تێدایە، وە وەکو وتمان الزُهري شێخی زۆر بووە و جاری وا هەبووە هەمان فەرموودەی لە دوو یان سێ شێخیەوە گێڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە ڕێگای یەکەم و دووەمیش صَحيح ە، وەک چۆن ئیمام ئاماژەی پێدا.

ئەم حاڵەتەی باسی ئەکەین تەنها بۆ الزُهري ڕاستە، ئەگەر هەر کەسێکی تر بێت دوو کەسی ثِقة بە دوو ڕێگەی جیاواز فەرموودەی لێوە بگێڕنەوە ئەوە ئەبێت دانەیەکیان هەڵبژێرین، جا ئەوکات بۆ یەکلا بوونەوە تەماشا ئەکەین بزانین ژمارەی ڕاوی کام لا زۆرترە، وە حاڵی ڕاوی هەر ڕێگەیەک لەو شێخەیدا کە فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە چۆنە .

**٢** - فەرموودەی دووەم بە دوو ڕێگا گێڕدراوەتەوە :

ڕێگای یەکەم : مالِک و إبن عَجلان عن سَعيد المَقبُري عن أبي شُرَيح الخُزاعي .

ڕێگای دووەم : عبدالرحمن بن إسحاق عن سَعيد المَقبُري عن أبي هُرَيرة .

## لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەکان :

- ڕێگای یەکەم :

مالِک بن أنس گێڕاویەتیەوە کە ثِقة و ثَبت ـە، وە محمد بن عَجلان کە صَدوق ـە و فەرموودەکانی سَعيد المَقبْري لێ تێکەڵ بووە، واتە نازانێت سَعيد المَقبُري عن أبي هُرَيرة يە، يان سَعيد المَقبُري عن أبيه عن أبي هُرَيرة .

- ڕێگای دووەم :

عبدالرحمن بن إسحاق گێڕاویەتیەوە کە پلەی صَدوق ی پێدراوە .

ئەنجام :

ڕێگای یەکەم صَحیح ە چونکە ژمارەی ڕاویەکانی زۆرترە، وە لەناو ڕاویەکانیشدا ثِقة و ثَبت ی تێدایە بە پێچەوانەی ڕێگای دووەم کە تەنها یەک صَدوق ی تێدایە .

**٣** - فەرموودەی سێیەم بە دوو ڕێگا گێڕدراوەتەوە :

ڕێگای یەکەم : صالح بن أبي الأخضَر عن الزُهري عن سَعيد بن المُسَيب عن أبي هُرَيرة .

ڕێگای دووەم : مَعمَر عن الزُهري عن مسعود بن الحكم .

لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەکان :

- ڕێگای یەکەم :

صالح بن أبي الأخضَر گێڕاویەتەوە، صالح خزمەتکاری الزُهري بووە، بەڵام ضَعیف ە و حِفظ ی خراپە .

- ڕێگای دووەم :

مَعمَر گێڕاویەتەوە کە ثِقة یە .

ئەنجام :

ڕێگای دووەم ڕاستە چونکە مَعمَر ثِقة و صالح ضَعیف ـە .

**٤** - فەرموودەی چوارەم بە دوو ڕێگا گێڕدراوەتەوە :

ڕێگای یەکەم : زائِدة عن عاصِم عن أبي صالح عن أبي هُرَیرة .

ڕێگای دووەم : الأعمَش عن أبي صالح عن أبي هریرة .

## لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەکان :

- ڕێگای یەکەم :

عاصِم لە أبي صالح ـەوە گێڕاویەتەوە، عاصِم بن أبي نَجود یان عاصم بن بَهدَلة خۆی کەسێکی ڕاستگۆیە، وە لە قیرائاتی قورئاندا حوججەیە، چونکە قیرائەی (حَفص عن عاصِم) ی لێوە گێڕدراوەتەوە، بەڵام لە فەرموودەدا لەبەرکردنی باش نییە، هەربۆیە پلەی صَدوق ی پێدراوە .

هەرکەسێک هەردوو مەرجی (عَدالة و ضَبط) ی تێدابوو بە تەواوی ئەوە پلەی ثِقة ی پێ ئەدرێت .

وە هەر کەسێک مەرجی (عَدالة) ی تەواو بوو بەڵام لە مەرجی دووەم واتە (ضبط) ـدا کێشەی هەبوو و لەبەرکردنی لاواز بوو ئەوە پلەی صَدوق ی پێ ئەدرێت، وە ئەگەر لەبەرکردنی هەر زۆر لاواز بێت ئەوە پلەی ضَعیف ی پێ ئەدرێت .

- ڕێگای دووەم :

الأعمَش له أبي صالح گێڕاویەتەوە، ثِقة و حافظ و مُتقِن بووە، وە بە تایبەتیش له أبي صالح ـدا یەکێکە لە جێگیرترین کەسەکان .

ئەنجام :

ڕێگای دووەم ڕاستە وەک چۆن ئیمام ئاماژەی پێداوە، چونکە ڕاویەکەی ثِقة یە .

• الإمام عليّ بن المَدِينيّ رَحِمَهُ الله تعالى :

[١ - (حَديثُ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ : (إِذَا زَنَتْ أَمَةُ أَحَدِكُمْ، فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا؛ فَلْيَجْلِدْهَا) .

رَوَاهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ سَعيد قَالَ : سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ .

فَنَظَرْتُ؛ فَإِذَا سَعِيدٌ لَمْ يَسْمَعْهُ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَرَوَاهُ ابْنُ إِسْحَاقَ، وَلَيْثُ بْن سَعْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَرَوَاهُ أَيُّوبُ بْنُ مُوسَى، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَالحَدِيثُ عِنْدِي : حَدِيثُ سَعْيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَحَدِيثُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدٍ قَالَ : سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُوْلُ : وَهَمْ، وَأَخَافُ أَنْ لا يَكُوْنَ حَفِظَهُ) .

٢ - (حَديثُ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ : (لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ المَوت) .

رَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي حَفْصَةَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ .

وَرَوَاهُ يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ؛ فَتَابَعَ ابْنَ أَبِي حفصة.

وَخَالَفَهُمَا ابْنُ أَبِي الأَخْضَرِ، وَسُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ؛ فَرَوَيَاه عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ).

٣ - (حَدِيْثُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: (إِنَّ الرَّحِمَ شَجْنَةٌ مِن الرَّحْمَنِ).

رَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرُو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

وَهُوَ عِنْدِي: خَطأً لَا شَكَّ فِيهِ.

لأَنَّ الزُّهِرِيَّ رَوَاهُ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَن أَبِي الرَدَّادِ اللَّيْنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَهُوَ عِنْدِيَ الصَّوَابُ)] وته‌ى ئيمام ته‌واو بوو.

## ● ڕوونكردنەوەو زانیاری زیاتر :

١ - فەرموودەی یەكەم بە سێ گێڕدراوەتەوە :

ڕێگای یەكەم : عبدالرحمن بن إسحاق عن سعيد قال سمعت أبا هريرة .

ڕێگای دووەم : أيوب بن موسى عن سعيد عن أبي هريرة .

ڕێگای سێیەم : محمد بن إسحاق و ليث بن سعد عن سعيد بن أبي سعيد عن أبيه عن أبي هريرة .

### لێكۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەكان :

- ڕێگای یەكەم :

عبدالرحمن بن إسحاق گێڕاویەتیەوە كە پلەی صَدوق ی پێ دراوە .

- ڕێگای دووەم :

أيوب بن موسى گێڕاویەتیەوە كە پلەی ثِقة ی پێ دراوە .

- ڕێگای سێیەم :

ليث بن سعد گێڕاویەتیەوە كە پلەی ثِقة ثَبت و پلەی جێگیرترین كەسی لە سعيد بن أبي سعيد پێدراوە .

وه محمد بن إسحاق كه له ڕاستیدا صَدوق ـه، بەڵام له سعید بن أبي سعید ـدا یەكێكه له جێگیرترین كەسەكان .

ئەنجام :

ڕیوایەتەكانی سعید بن أبي سعید له أبي هُریرة دوو جۆرن :

- سَعید بن أبي سَعید المَقبُري عن أبي هُریرة .

- سَعید بن أبي سَعید المَقبُري عن أبیِهِ عن أبي هُریرة .

وه جێگیرترین كەس تێیدا لَیث بن سَعد ـه، چونكه ئەزانێت كام فەرموودەیەی ڕاستەوخۆ له أبي هُریرة ڕیوایەت كردووه، وه كام فەرموودەشی به واسیتەی باوكی له أبي هُریرة ڕیوایەت كردووه .

هەر بۆیه لێرەدا ئیمام ڕێگەی سێیەم هەڵئەبژێرێت بەسەر دوو ڕێگەكەی تردا .

**٢** - فەرموودەی دووەم به دوو ڕێگا گێڕدراوەتەوه :

ڕێگای یەكەم : محمد بن أبي حَفصة و یونس بن یزید عن الزُهري عن أبي عبید عن أبي هریرة .

ڕێگای دووەم : صالح بن أبي الأخضر و سفیان بن حسین عن الزُهري عن عبیدالله عن أبي هریرة .

لێكۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەكان :

- ڕێگای یەكەم :

یونس بن یزید گیراویەتیەوە كە پلەی ثِقة ثَبت ی پێدراوە .

لەگەڵ محمد بن أبي حفصة كە پلەی صَدوق یان ثِقة ی پێدراوە .

- ڕێگای دووەم :

صالح بن أبي الأخضر گێڕاویەتیەوە كە ضَعیف ە .

وە سفیان بن حسین گێڕاویەتیەوە كە ضَعیف لە الزهري دا چونكە ڕیوایەتەكانی لە الزهري تێكەڵكردن و شتی نامۆی تێدایە .

ئەنجام :

بە ئاسانی بۆمان دەرئەكەوێت كە سەنەدی یەكەم ڕاستە چونكە ڕاویەكانی بەهێزترن .

٣ - فەرموودەی سێیەم بە دوو ڕێگا گێڕدراوەتەوە :

ڕێگای یەكەم : محمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة .

ڕێگای دووەم : الزُهري عن أبي سلمة عن أبي الرداد اللين عن عبدالرحمن بن عوف .

لێکۆڵینەوە لە حاڵی ڕاویەکان :

- ڕێگای یەکەم :

محمد بن عمرو گێڕاویەتیەوە کە پلەی صَدوق ی پێدراوە .

- ڕێگای دووەم :

الزُهري گێڕاویەتیەوە کە پلەی ثِقة ثَبت مُتقِن ی پێدراوە .

ئەنجام :

بە ئاسانی ئەگەین بەوەی کە ڕێگای دووەم ڕاستە چونکە الزُهري بەهێزترە لە محمد بن عمرو .

والحمدلله رب العالمين

## الإمام عبدالملك بن عبدالعزيز بن جُرَيج المكي (٨٠ - ١٥٠ هـ)

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (أوَل مَن صَنَفَ كُتُب إبن جُرَيج) .

لەپێش إبن جُرَيج کتێب نووسراوە، بەڵام مەبەست لە كُتُب لێرەدا نووسینی کتێبە بەشێوازی ڕیزبەندی فیقهی و دانانی باب .

شێخی عبدالرزاق ی شێخی ئیمام أحمد ە .

- إبن جريج ئەڵێت : (چووم بۆلای عطاء بن أبي رباح بۆ فێربوونی فەرموودە و عبدالله بن عُبَيد بن عُمَير ی لەلا بوو .

عبدالله بن عُبَيد پێی وتم : ئایا قورئانت لەبەر کردووە ؟

وتم : نەخێر .

وتی : بڕۆ قورئان لەبەر بکە پاشان تەڵەبی زانست بکە .

جا ڕۆیشتم هەندێک ماوەم پێچوو هەتا قورئانم لەبەر کرد .

پاشان هاتمەوە بۆلای عطاء عبدالله بن عمير ی لەلا بوو .

پێی وتم : قورئانت لەبەر کرد ؟

وتم : بەڵێ .

وتی : ئایا فێری فەرزەکان بوویت ؟

وتم : نەخێر .

وتی : فێری فەرزەکان ببە ئینجا تەڵەبی عیلم بکە .

فێری فەرزەکان بووم و پاشان گەڕامەوە .

وتی : فێری فەرزەکان بوویت ؟

وتم : بەڵێ .

وتی : ئێستا تەڵەبی عیلم بکە .

إبن جريج وتی : پاش ئەوە حەڤدە ساڵ بەردەوام لەگەڵ عطاء دا بووم ) .

عطاء بن أبي رباح تەلەبەی هەریەک لە هاوەڵان عبدالله بن عمر و عبدالله بن عباس و جابر بن عبدالله و عائشة بووە رضي الله عنهم جميعا .

إبن جريج تەلەبەی دوو عطاء ی تریشە .

عطاء الخراساني، کە تەلەبەی إبن عباس بووە رضي الله عنە .

وە عطاء بن يسار، کە تەلەبەی أبو سعيد الخدري بووە رضي الله عنه .

مەبەستمان بەوەی فڵانە کەس تەلەبی فڵان کەس بووە، ئەوەیە ڕیوایەتی لێوە کردووە .

- عبدالرزاق الصنعاني ئەڵێت : (هەژدە ساڵ لەگەڵ إبن جريج دا بووم) .

عمرو بن دينار تەلەبەی إبن عباس و تەلەبەی تەلەبەکانی إبن عباس بووە رضي رضي الله عنه، وە یەکێکە لەو شەش کەسەی مەداری سەنەدەکانیان لەسەرە .

- إبن جريج ئەڵێت : (پاش عطاء نۆ ساڵ لەلای عمرو بن دينار دانیشتم) .

- پرسیاریان لە عطاء بن أبي رباح کرد : دوای خۆی پرسیار لە کێ بکەین ؟

وتی : ئەم گەنجە، واتە إبن جريج، ئەگەر ژیا .

- علي بن المديني ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە يحيى بن سعيد القطان : هاوەڵانی نافع کامەیان جێگیرترینە ؟

وتی : أيوب السختياني، وعبيدالله، ومالک، وە إبن جريج جێگیرترە لە مالک لە نافع دا) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (عمرو بن دينار و إبن جريج جێگیرترین کەسن لە عطاء بن أبي رباح) .

- عبدالرزاق الصنعاني ئەڵێت : (نەمبینیوە کەسێک جوانتر و باشتر نوێژ بکات لە إبن جريج) .

زۆر خواپەرست بووە، لە مانگێکدا تەنها سێ ڕۆژ بەڕۆژوو نەبووە .

تەلەبەی أبي الزبير بووە .

وە تەلەبەی حميد الطويل و هشام بن عروة و يحيى بن سعيد الأنصاري و محمد بن المنكدر و الزهري بووە .

## الإمام مَعمَر بن راشـِد (٩٥ - ١٥٣ هـ)

لە بەسرە لەدایک بووە، بەوە ناسراوە کە زۆر تەڵەبی عیلمی کردووە، پاشان لە یەمەن جێگیر بووە، خەڵکی یەمەن نەیانویستووە ئەم گەوهەرەیان لەدەست بچێت هەر بۆیە ئافرەتێکی یەمەنیان پێداوە و زەواجی لەگەڵ کردووە .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (مَعمَر بەراورد ناکرێت بە هیچ کەسێک ئیللا مَعمَر پێشی ئەکەوێت، وە لە سەردەمی خۆیدا لە هەموو کەسێک زیاتر هەوڵی بەدەستهێنانی زانستی داوە) .

معمر بن راشد ڕیوایەتی لە ئەو شەش کەسەوە کردووە کە مەداری ئیسنادیان لەسەرە .

وە هیچ کەسێک جگە لە معمر بن راشد تەلەبەی ڕاستەوخۆی ئەو شەش کەسە نەبووە رحمهم الله تعالى .

لە هەمان کاتدا معمر تەلەبەی ثابت البناني تەلەبەی نزیکی هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالک رضي الله عنه بووە .

وە تەلەبەی هشام بن عروة بن الزبیر و أیوب السَختیاني و همام بن منبه بووە .

همام بن منبه برای وهب بن منبه ە، وە خاوەنی صەحیفەیەکە لە أبو هریرة رضي الله عنه .

معمر یەکێکە لە ڕاویەکانی صەحیفەکەی همام بن منبه .

معمر بن راشد خاوەنی كتێبی (الجامع) ە، عبدالرزاق الصنعاني تەلەبەی هەرە نزیكی معمر لە كتێبە بەناوبانگەكەیدا (المصنف) كتێبی (الجامع) ەكەی معمر ی ڕیوایەت كردووە .

معمر ئەڵێت : (لەلای قتادة دانیشتم تەمەنم **١٤** ساڵان بوو، هەر شتێكم لێ بیستبێت وەكو ئەوە وایە لەسەر سنگم هەڵكۆڵدرابێت) .

## الإمام عبدالرحمن بن عمَرو الأوزاعِي (٨٨ - ١٥٧ هـ)

له شام لەدایک بووە، فەقیهـو فەرموودەوان بووە و خاوەنی مەزهەبی خۆی بووە.

له شام هاوەڵانی بەڕێز واثِلة بن أسقَع، أبو الدَرداء و مِقداد بن الأسود و چەند هاوەڵێکی تری بەڕێز رضي الله عنهم ژیاون .

وه هاوەڵانی بەڕێز خالد بن وليد و بلال الحبشي و معاذ بن جبل و أبو عبيدة بن الجراح له شام وەفاتیان کردووە رضي الله عنهم .

الأوزاعي گەشتی بۆ بەسرە کردووە، کاتێک گەیشتووەته ئەوێ الحسن البصري وەفاتی کردووە، وه إبن سيرين له نەخۆشی وەفاتیدا بووە .

له بەسرە تەلەبەی قتادة بن دعامة السدوسي بووە .

له مەدینه تەلەبەی الزُهري بووە .

له مەککه تەلەبەی عَطاء بن أبي رَباح بووە .

عَطاء ڕەش پێست و شەل بووە، وه چاوێکی کوێر بووە، وه له کۆتایی ژیانیدا دەستی بڕاوە .

عَطاء بەندە بووە، خاوەنەکەی که بەم شێوەیه بینیویەتی پێی وتووە بڕۆ بۆ حەرەمی مەککه فێری زانست ببە، چونکه دیارە له ئیش و کاردا ئەوەندە سوودی پێ ناگەیەنێت .

جا له حەرەمی مەککه له مەجلیسەکاندا دانیشتووە و بووە بە تەلەبەی عبدالله بن عمر و عبدالله بن عباس و جابر بن عبدالله و چەندین هاوەڵی تر .

پاشان وای لێهات بوو بە شارەزاترین و فەقیهترین تابیعی لە بابەتی المَناسِکـ ەکانی حەج .

وە الأوزاعي تەلەبەی يحيى بن أبي كَثير اليَمامي (**١٣٢** هـ) بووە .

الأوزاعي و مالك و سفيان هەرسێكيان تەلەبەی محمد بن المُنكَدِر بوون، محمد بن المُنكَدِر كوڕی خاڵ (خاڵۆزا) ی دايكی ئیمانداران عائشة بووە .

الأوزاعي نامەی بۆ دەسەڵاتداران نووسیوە بە مەبەستی ڕوون كردنەوەی حاڵی خەڵكی و باشتر كردنی بارودۆخیان .

- إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (ئەگەر مالك و الأوزاعي و سفيان لەسەر شتێک کۆبوونەوە ئەوە سوننەتە) .

## الإمام شُعبَة بن الحَجاج (٨٥ - ١٦٠ هـ)

وەکو ئیمامی مالک و الأوزاعي و الثوري و إبن المبارك خاوەنی مەزهەبی خۆی نەبووە، بەڵام لە گەورەترین رەخنەگرانی فەرموودە و رجال ی فەرموودەیە .

فەرموودەوانان زۆر بەپەرۆش بوون بۆ ئەوەی ڕیوایەت لە شُعبة بکەن، وە ڕیوایەتی زیاتر لێکراوە لە هەموو ئەو ئیمامانەی تا ئێستا باسمان کردووە .

هۆکارەکەش ئەوەیە کە شُعبة هەمیشە ڕیوایەت لە کەسی ثِقة ئەکات، بە دەگمەن ڕیوایەت لە کەسێکی غیر ثِقة ئەکات، وە ئەگەر ڕیوایەت بکات لە کەسێک کە ثقة نەبێت ئەوە خۆی ئاماژەی پێ ئەدات فلانە کەس کە ڕیوایەتی لێوە کردووە ثقة نییە .

زۆر توند بووە لە وەرگرتنی فەرموودە لە شێخەکانیەوە، بە شێوەیەک ئەگەر کۆمەڵە فەرموودەیەکی لە شێخێکیەوە ببیستایە، ئەوە پاش ماوەیەکی تر ئەڕۆشتەوە بۆلای هەمان شێخ تا بزانێت فەرموودەکانی بە هەمان شێوەی یەکەمجار بۆ ئەگێڕێتەوە یان نا، ئەگەر بەشێوەی یەکەمجار بۆی بگێڕایەتەوە ئەوە بە ثِقة ی دائەنا، ئەگەر وا نەبووایە بە ثقة داینەئەنا .

شعبة بە شێوەیەک توند بووە کە ریوایەت کردنی لە شێخێکەوە بووە بە تعدیل بۆ شێخەکە، أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (ئەگەر بینیت شعبة ڕیوایەت لە کەسێکەوە ئەکات ئەوە بزانە ثقة یە) .

- يحيي بن سعيد القطان ئەڵێت : (شعبة زاناترین کەس بوو بە فەرموودە).

- أحمد بن حنبل دەربارەی شعبة ئەڵێت : (بە تەنها خۆی ئوممەتێک بوو لەم بوارەدا - واتە لە رجال ی فەرموودە و وەرگرتنی تەنها لە کەسی ثقة وە - ) .

- عبدالله بن إدريس الأودي ئەڵێت : (شعبة پێشەوای فەرموودەوانان بوو).

- حماد بن زيد ئەڵێت : (أيوب السختياني - شێخی شعبة - وتی : ئێستا کەسێکتان پێ ئەناسێنم لە ئەهلی واسط ، سوارچاکە لە فەرموودەدا، فەرمووی لێ وەرگرن ) .

- أبو الوليد الطيالسي ئەڵێت : (حماد بن سلمة پێی وتم : ئەگەر فەرموودەت ئەوێت ئەوە پەیوەستبە بە شعبة ـەوە ) .

وە ئەڵێت : (حماد بن زيد وتی : بەلامەوە گرنگ نییە هەر کەسێک موخالەفەم بکات ئەگەر شعبة هاوڕام بێت ) .

لەبەر ئەوەی شعبة ئەبووایە چەند جارێک هەمان فەرموودەی لە هەمان شێخەوە و لە کاتی جیاوازدا ببیستێت ئینجا ڕیوایەتی ئەکرد بۆ ئەوانەی پاش خۆی .

- سفيان الثوري ئەڵێت : (شعبة پێشەوای ئیماندارانە لە فەرموودەدا ) وە بە شعبة ی ئەوت (مامۆستاکەمان ) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (لە سەردەمی شعبة دا هیچ کەسێک نەبووە وەکو ئەو باش بێت لە فەرموودەدا) .

- أبو داود الطيالسي ئەڵێت : (کاتێک شعبة وەفاتی کرد سفيان الثوري وتی : فەرموودە مرد) .

تەماشای ئەم هەموو وەسفانەی شعبة بکە لەلایەن گەورە پێشەوایانەوە، کەچی ئەم هەموو باشیەتی و گەورەییەی شعبة وای نەکردووە لە فەرموودەوانان ڕەخنەی لێ نەگرن و خاڵی لاوازی نەخەنە ڕوو .

شعبة بەوە ناسرابوو کە زۆر بە کەمی هەڵە ئەکات لە ناوی ڕاویەکاندا، بۆ نمونە لەجیاتی بڵێت : (خالد بن عرفجة) وتویەتی : (مالک بن عرفجة) .

- العِجلي ئەڵێت : (شعبة ثَبت ـە لە فەرموودەدا، بە کەمی هەڵەی ئەکرد لە ناوی رجال ـەکاندا) .

واتە لە مەتنی فەرموودەکەدا هیچ کێشەی نەبووە و وەکو خۆی ڕیوایەتی کردووە، بەڵام بە کەمی هەڵەی کردووە لە ناوی رجال ی سەنەدەکاندا .

- يزيد بن هارون ئەڵێت : (ئەگەر شعبة نیەتی بۆ الله عز وجل نەبووایە ئەوە بەم شێوەیە بەرز نەئەبوویەوە) .

- حماد بن زيد ئەڵێت : (ئەگەر شعبة لە فەرموودەدا موخالەفەی کردم ئەوە شوێنی ئەکەوم) .

وتیان : بۆچی ؟

وتی : (چونکە شعبة فەرموودەی چەند جارێک ئەبیست، بەڵام من یەک جار ئەمبیست - واتە لە شێخەکەمەوە - ) .

چونکە شعبة ئەگەر دوو جار هەمان فەرموودەی لە هەمان شێخ و کاتی جیاوازەوە نەبیستایە نەیئەگێڕایەوە .

- أبو الولید ئەڵێت : (پرسیارم لە شعبة کرد دەربارەی فەرموودەیەک، وتی بۆت ناگێڕمەوە چونکە تەنها یەک جار بیستوومە بە إبن عون ـەوە) .

شعبة فەرموودەی لە أبي إسحاق السبیعي (**٣٣ - ١٢٧** هـ) بیستووە .

أبو إسحاق السبیعي گەیشتووە بە هەندێک هاوەڵ و فەرموودەی لێیانەوە بیستووە .

شعبة فەرموودەی لە محمد بن المنکدر (**٥١ - ١٣٠** هـ) بیستووە .

وە فەرموودەی لە ثابت البناني و حمید و سلیمان التیمي و یحیی بن سعید الأنصاري ی تەلەبەی هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالک بووە رضي الله عنه .

فەرموودەی لە هشام بن عروة ـوە بیستووە .

فەرموودەی لە حبیب بن أبي ثابت فەقیهی ئەهلی کوفەوە بیستووە، حبیب بن أبي ثابت گەیشتووە بە هەندێک لە هاوەڵان رضي الله عنهم .

وە فەرموودەی لە عاصم بن بهدلة خاوەنی قیرائەتی (حفص عن عاصم) بیستووە.

فەرموودەی لە عمرو بن دینار بیستووە .

وه تەلەبەی نزیکی قتادة بن دعامة السدوسي یه .

فەرمووده‌ی له أبي الزبير ی تەلەبەی نزیکی جابر بن عبدالله رضي الله عنه بیستووه .

وه فەرمووده‌ی له معاوية بن قرة المزني بیستووه، باوکی معاوية قرة بن اياس هاوەڵی بەرێز بووه رضي الله عنه .

فەرمووده‌ی له موسى بن أنس بن مالک بیستووه .

فەرمووده‌ی له أبو عمران الجوني تەلەبەی جندب رضي الله عنه بیستووه .

گەیشتووه به الحسن البصري (**٢١ - ١١٠** هـ) بەڵام فەرمووده‌ی لێوه نەبیستووه.

## الإمام سُفيان بن سَعيد بن مَسروق الثَوري (٩٧ – ١٦١ هـ)

خەڵکی کوفەیە، یەکێکە لەو ئیمامانەی کە چەند تایبەتمەندیەکی تێدا کۆبووەتەوە .

لە سەردەمی خۆیدا لە زوهد دا گەیشتووەتە بەرزترین پلە، هەر بۆیە أبو نعیم لە کتێبی (حلية الأولياء) دا بە درێژی باسی ژیاننامەکەی کردووە .

لە سەردەمی خۆیدا لە فیقهـدا گەیشتووەتە بەرزترین پلە، هیچ کتێبێک سەلەف نابینیت کە لە بواری فیقهـدا نووسیبێتیان ئیللا چەندین وتەی سفیان یان نقڵ کردووە لە بابەتە فیقهیەکاندا .

لە سەردەمی خۆیدا لە بواری فەرموودەدا گەیشتوەتە لوتکە، لەلایەن ئەهلی سوننەوە پێی وتراوە (أمير المؤمنين في الحديث)، لە فەرموودەدا ثقة بووە، لە هەموو کتێبەکانی فەرموودەدا ڕیوایەتی لێوە کراوە .

وە لە هەمان کاتیشدا لە ئیمامەکانی جرح و تعديل بووە، هیچ کتێبێک نابینیت سەلەف نووسیبێتی دەربارەی رجال ی فەرموودە ئیللا چەندین وتەی سفیان ی تێدا ڕیوایەت کراوە رحمه الله تعالى .

لە هەمان کاتیشدا ئیمامی ئەهلی سوننە و جەماعە بووە، هیچ کتێبێکی ئەهلی سوننە نابینیت ئیللا چەندین وتەی سفیان یان لەبواری عەقیدەدا نقڵ کراوە .

لە هەمان کاتیشدا کەسێک بووە کە زۆر حەقبێژ بووە، لەگەڵ ئەمیر و خەلیفەکاندا چەندین تێکگیرانی هەبووە، تەنانەت أبو جعفر المنصور فەرمانی کوشتنی

سفیان ی دەرکرد لەبەر ئەوەی چەندین جار بانگی کردبوو بۆ ئەوە بیکات بە قاضي و دەسەڵاتی بداتێ بەلام سفیان قبووڵی نەکرد، پاشان سفیان دوعای لێکرد و المنصور مرد .

وەک چۆن لە مەدینە چەندین هاوەڵی بەڕێزی لێبووە، وە ئەم هاوەڵە بەڕێزانە تەلەبەیان هەبووە، لە تەلەبەکاندا فەقیهـ و موفەسیر و فەرمووودەوانیان تێدا بووە، وە پاشان ئیمامی مالک تەلەبەی تەلەبەکانی هاوەڵان بووە، بە هەمان شێوە کوفە هاوەڵی بەڕێز عبدالله بن مسعود ی لێبووە .

بێگومان عبدالله بن مسعود یەکێکە لە زاناترینی هاوەڵان رضي الله عنهم، هەر لە کوفە پێشەوای ئیماندارن علي بن أبي طالب و أبو مسعود البدري و حذيفة بن اليمان و سلمان الفارسي و عمار بن یاسر ی لێبوون رضي الله عنهم جميعا .

وەک چۆن لە باسی ئیمام مالک دا وتمان حەوت فەقیهی بەناوبانگ هەبوون لە مەدینە، بە هەمان شێوە لە کوفە عبدالله بن مسعود رضي الله عنه چەندین تەلەبەی هەبووە، لێیەوە فێری قورئان و فەرموودە و فیقهـ بوون .

لەوانە :

- عَبيدة السَلماني .
- الأسوَد بن يَزيد (تەلەبەی تایبەتی عائشة رضي الله عنها) .
- مَسروق بن الأجدَع (بەندەی ئازادکراوی عائشة رضي الله عنها) .
- عَلقَمة بن قَيس .
- عبدالرحمن بن يَزيد .

زانستی إبن مسعود رضي الله عنه لەڕێگەی تەلەبەكانیەوە گواسترایەوە بۆ خەڵكی هەتا لە كوفە ئیمامێكی وەكو الأعمَش (٦١ - ١٤٨ هـ) دەركەوت .

القاسم بن عبدالرحمن بن عبدالله بن مسعود كە نەوەی عبدالله بن مسعود ە شایەتی ئەدا بۆ الأعمَش ئەیوت : (شارەزاترین كەسە بە فەرموودەی عبدالله) .

الأعمَش تەلەبەی إبراهیم النَخَعي بووە، كە خاوەنی مەزهەبێكی فیقهی بووە، بەشێكی هاوەڵانی إبن مسعود رضي الله عنه خزمی نزیكی إبراهیم النَخَعي بوون .

إبراهیم النَخَعي دایكی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها ی بینیوە بەڵام هیچی لێوە ڕیوایەت نەكردووە چونكە ئەوكات منداڵ بووە، لە ڕێگەی الأسود بن یزید ی خاڵیەوە ڕیوایەتی لە عائشة كردووە .

بۆیە باسی زاناكانی كوفەمان كرد تا بزانیت سفیان الثوري لەبەر ئەوەی خەڵكی كوفە بووە زانستی ئەو زانایانەی وەرگرتووە .

ئیمام سفیان الثوري گەشتی كردووە بۆ بەسرە، لەوێ بووە بە تەلەبەی تەلەبەكانی الحسن البصري و إبن سیرین .

وە چووە بۆ مەدینە و لەوی مالک ی بینیوە، وتمان مالک بن أنس جێگیرترین كەس بووە لە الزهري، بە هەمان شێوە سفیان الثوري ڕیوایەتی كردووە لە الزهري بەڵام ڕاستەوخۆ نا بەڵكو بەهۆی واسیتەیەكی نێوانیانەوە، سفیان بەهۆی فەقیریەوە نەیتوانیوە گەشت بكات بۆلای الزهري تا ببێت بە تەلەبەی .

مالک تەلەبەی ڕاستەوخۆی نافع ی مەولای إبن عمر بووە، بەڵام سفیان بە واسیتەی عبیدالله بن عمر العمري ڕیوایەت لە نافع ئەكات .

لەلایەکی دیکەوە سفیان تەلەبەی أبو إسحاق السبيعي بووە، بە واسیتەی أبو إسحاق ئەتوانێت ڕیوایەت لە الحسن بن علي و البراء بن عازب رضي الله عنهما بكات.

بە واسیتەی سِماک بن حَرب ڕیوایەت لە نُعمان بن بَشير رضي الله عنه ئەكات.

بە واسیتەی أبي الزبير ڕیوایەت لە جابر بن عبدالله رضي الله عنه ئەكات .

مالک و سفیان هەردووكیان تەلەبەی مالک بن دینار بوون، مالک بن دینار تەلەبەی هاوەڵی بەڕێز عبدالله بن عمرو بن العاص بووە .

مالک و سفیان هەردووكیان تەلەبەی هشام بن عروة بن الزبير بوون .

هەردووكیان تەلەبەی جعفر الصادق نەوەی ئیمامی علي رضي الله عنه بوون .

كەواتە سفیان لە ڕێگەی شێخەكانیەوە ئەتوانێت بە یەک یان دوو واسیتە بگات بەو هاوەڵانەی كە ڕیوایەتی زۆریان لێوە كراوە رضي الله عنهم .

ئیمامی سفیان كتێبێكی هەبووە بەناوی (الجامع) بەڵام كتێبەكە فەوتاوە، بەڵام دوو بەرهەمی چاپكراوی هەیە بە ناوەكانی (تفسير سفيان الثوري) و (كتاب الفرائض) .

- شُعبَة بن الحَجاج (١٦٠ هـ) كە قەرینی سفیان هـ ئەڵێت : (سفیان پێشەوای ئیماندارانە لە فەرموودەدا) .

- عبدالرحمن بن المهدي ئەڵێت : (هیچ كەسێكم نەبینیوە وەكو سفیان بێت).

- عبدالله بن المبارک ئەڵێت : (هیچ كەسێكمان نەبینیوە وەكو ئەو بێت) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هیچ كەس لە دڵمدا پێشی ناكەوێت) .

سفيان ئەوەندە بەرامبەر دەسەڵاتداران توند بووە الأوزاعي لەبارەیەوە ئەڵێت : (له مردن ناترسێت ) .

سفيان له سەرەتای تەمەنیدا شيعي بووە، واته ئیمامی علي ی رضي الله عنهما پێشخستووە بەسەر ئیمامی أبو بكر و عمر، پاشان وازی لەوە هێناوە و ئیمامی علي پێشخستووە بەسەر ئیمامی عثمان رضي الله عنها، پاشان له کۆتاییدا هاتووەته سەر عەقیدەی ئەهلی سوننە و ئیمامی عثمانی پێشخستووە بەسەر ئیمامی علي رضي الله عنهم جميعا .

## الإمام ليث بن سعد الفهمي (٩٤ - ١٧٥ هـ)

له الأصبهان له قَلقَشَندَه لەدایک بووە، له مصر جێگیر بووه و ئیمامیان بووه .

خاوەنی مەزهەبی خۆی بووه، هاوتەمەنی ئیمام مالک بووه رحمهم الله، لەگەڵ مالک دا گفتوگۆ و موناقەشاتی زۆریان هەبووه لەسەر بابەتە فیقهیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕێزیان لەیەک گرتووە .

فەرموودەی صحیح ی زۆر بووه، وه بازرگان بووه، بەوە مەشهورە کە زۆر سەخی و دەستکراوە بووە .

جارێکیان لە کاروانێکی بازرگانیدا هەنگوین ئەهێنێت، ئافرەتێک دێت بۆلای ئەڵێت نەخۆشم دکتۆر پێی وتووم تۆزێک هەنگوین بخۆم .

لیث هەنگوینێکی زۆری پێ ئەدات .

بە لیث یان ئەڵێن : (ئەوە خۆ داوای کەمێکی کرد ! ) .

لیث ئەڵێت : (داوای کرد ئەوەندەی کە خۆی توانی، ئێمەش پێی ئەدەین ئەوەندەی کە بتوانین ) .

لە مصر هاوەڵی بەڕێز عمرو بن العاص و عبدالله بن عمرو بن العاص و عُقبة بن عامر الجُهَني ژیاون .

لیث تەلەبەی الزهري بووە .

وە تەلەبەی سَعید بن أبي سعید المَقبوري بووە، وە جێگیرترین کەسە تێیدا، سَعید بن أبي سعید المَقبوري خۆی و باوکی تەلەبی هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة بوون .

لیث تەلەبەی عطاء بن أبي رباح بووە .

وە تەلەبەی نافع ی مەولای إبن عمر بووە رضي الله عنهما .

وە تەلەبەی هِشام بن عُروة و یحیى بن سعید الأنصاري و یَزید بن أبي حَبیب النوبي بووە .

یَزید بن أبي حَبیب النوبي لە سەردەمی خۆیدا زانای مصر بووە، گەیشتووە بە هەندێک لەو هاوەڵانەی کە لە مصر ژیاون، وە بە تەلەبەکانیان .

وە لیث تەلەبەی أبي الزبیر ی تەلەبەی بەناوبانگی جابر بن عبدالله بووە .

وە تەلەبەی أبو قُبَیل المُعافري تەلەبەی هاوەڵی بەڕێز عُقبة بن عامر الجُهَني بووە.

- إبنُ بُکَیر ی تەلەبەی ئەڵێت : (لیث فەقیهـ بوو، بەباشی قورئانی ئەخوێندەوە، وە لە نەحو و شیعردا باش بوو) .

- الشافعِي ئەڵێت : (لیث فەقیهترە لە مالک، بەڵام هاوەڵانی گرنگیان پێ نەدا).

واتە هاوەڵانی مالک زۆر گرنگیان بە مالک داوە لەچاو گرنگیدانی هاوەڵانی لیث بە لیث .

إبن وهب المصري تەلەبەی لیث و مالک بووە، لە کتێبەکانیدا عیلمی لیث و مالک ی زۆر ڕیوایەت کردووە .

هەمووساڵێک لیث سەد دیناری داوە بە مالک .

سالانە بیست هەزار دیناری پەیدا کردووە بەڵام پارەکەی هیچ زەکاتی نەکەوتووە، چونکە هەمیشە گەڕاوە بەدوای هەر زانا و فەقیهێکدا پێویستی بە پارە بێت پێی داوە .

وە هەرکاتێک مالک پارەی پێویست بووایە لە نامەیەکدا بۆی ئەنووسی ئەوەندەمان پارە ئەوێت و لیث بۆی ئەنارد .

## الإمام مالِك بن أنس الأصبَحي (٩٣ – ١٧٩ هـ)

مالک بن أنس تابیعی تابیعیه، وه له کاتێکدا لەدایک بووه که بەشێکی کەم له هاوەڵان رضي الله عنهم له ژیاندا مابوون .

له مەدینه لەدایک بووه و گەوره بووه، مەدینه ئەو شوێنەکه که رسول الله ﷺ، وه خەلیفه ڕاشیدەکان أبو بکر الصدیق و عمر بن الخطاب و عثمان بن عفان رضي الله عنهم تێیدا وەفاتیان کردووه و نێژراون .

بەم شێوەیه له نێوان منداڵ و نەوەکانی هاوەڵاندا گەوره بووه .

مالک بن أنس خاوەنی کتێبی (الموطأ) ە، ئەم کتێبه یەکێک له کۆنترین ئەو کتێبانەی که سوننەتی رسول الله ﷺ ی تێدا کۆکراوەتەوه .

لەم کتێبەدا فەرموودەی رسول الله ﷺ و قەولی هاوەڵان رضي الله عنهم و تابیعینی رحمهم الله تێدایه، وه قسەی ئیمام مالک ـیشی تێدایه .

وه ئیمامی مالک له کتێبەکەیدا ئەو فەرموودەیانەی ڕیوایەت کردووه که پشتگیری کراون به کار و کردەوەی ئەهلی مەدینه .

چونکه ئیمامی مالک پێی وا بووه لەبەر ئەوەی شاری مەدینه ناوجەرگەی دەوڵەتی ئیسلامی له سەردەمی رسول الله ﷺ و پاشان سێ خولەفای ڕاشیدین بووه، وه دانیشتووانی هەمووی موهاجیرین و ئەنسارٍ و منداڵ و نەوەکانیان بوون، لەبەر

ئەوە خەڵکی ئەم شارە لە هەموو شارێکی تر زیاتر پارێزگاریان لە سوننەتی رسول الله ﷺ و هاوەڵان کردووە .

واتە لەلای ئیمام مالک تەنها صحیح بوونی سەنەد مەرج نەبووە بۆ کارکردن بە فەرموودەکە، بەڵکو ئەبووایە فەرموودەکە پشتگیری بکرایە لەلایەن کار و کردەوەی ئەهلی مەدینەوە، چونکە ئەگەر فەرموودەیەکی ڕاستی لەوجۆرە هەبێت چۆن خەڵکی مەدینە لێی بێ ئاگا ئەبن ؟

وە لەلایەکی تریشەوە گەیشتنی فەرموودەیەک کە سەنەدەکەی صحیح بێت بە ئیمام مالک کارێکی ئاسان بووە، چونکە لە زۆربەی جارەکاندا تەنها بە دوو کەس ئەگاتەوە رسول الله صلى الله عليه وسلم .

کتێبی الموطأ لە ئیمام مالک ـەوە نۆ ڕیوایەتی هەیە، واتە نۆ کەس لە مالک ـەوە هەموو کتێبەکەیان گێڕاوەتەوە .

لەکاتی ژیانی ئیمامی مالک ـدا حەوت زانا هەبوون لە مەدینە کە بە (فُقَهاء السَبعة) بەناوبانگ بوون، حەوت فەقیهەکەی مەدینە ئەم زانایانە بوون :

- أبو بكر بن عبدالرحمن بن حارِث .
- القاسم بن محمد بن أبي بكر الصديق .
- عُروة بن الزُبَير العَوام .
- سُلَيمان بن يَسار .
- سَعيد بن المُسَيَب .
- عُبَيدِالله بن عبدالله بن عُتبة بن مسعود .

- خارِجة بن زَيد بن ثابِت .

ئیمامی مالک رحمه الله تەلەبەی هەموویان بووە رحمهم الله، لێرەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە مالک خاوەنی فیقهـو زانستێکی زۆر بووە بەهۆی ئەوەی تەلەبەی هەر حەوت فەقیهەکەی مەدینە بووە .

ئیمامی مالک خاوەنی عیلمی زۆر لەوە زیاترە، چونکە بە ڕێگەیەکی کورت گەیشتووە بەو هاوەڵانەی کە فەرموودەی زۆریان لێوە ڕیوایەت کراوە .

مەبەستەکە ڕوون ئەکەینەوە إن شاء الله :

- أبو هريرة .

- عبدالله بن عباس .

- عبدالله بن عمرو .

- عبدالله بن عمر .

- جابر بن عبدالله .

- أنس بن مالک .

- عائشة .

- أبو سعيد الخدري .

ئەم هاوەڵە بەڕێزانە رضي الله عنهم لەوانە بوون کە فەرموودەی زۆریان لێوە ڕیوایەت کراوە .

وە شێخی ئیمامی مالک ئیمام إبن شِهاب الزُهري زۆربەی فەرموودەی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی گەیاندووە بە مالک .

بۆ نمونە إبن شهاب الزُهري تەلەبەی عروة بن الزبير و عَمرة بنت عبدالرحمن بووە، ئەمانیش هەردووکیان تەلەبەی نزیکی عائشة بوون رضي الله عنها .

وە الزهري تەلەبەی ڕاستەوخۆی أنس بن مالک بووە رضي الله عنه .

وە الزهري تەلەبەی أبو سَلَمة بن عبدالرحمن بن عوف بووە، خودی أبو سَلَمة کوڕی هاوەڵی بەڕێزە، وە تەلەبەی أبو هريرة و جابر بن عبدالله و عائشة و إبن عباس بووە .

وە تەلەبەی سالم و حمزة ی کوڕی عبدالله بن عمر بن الخطاب بووە .

لێرەدا باسی ئەوەمان کرد کە چۆن الزهري تەلەبەی زۆربەی ئەو تابیعیانە بووە کە تەلەبەی ڕاستەوخۆی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بوون کە فەرموودەی زۆریان لێوە گێڕدراوەتەوە .

زانیت الزُهري رحمه الله بەو شێوەیە زانستەکەی فراوان بووە، پاشان بزانە کە مالک یەکێک لە تەلەبە هەرە نزیکەکانی الزهري بووە، النسائي ئەڵێت مالک بن أنس لە جێگیرترین کەسەکانە لە الزُهري ـەوە .

ئیمامی مالک لە کۆتایی تەمەنیدا لەلایەن دەسەڵاتداری مەدینەوە تووشی جەڵد لێدان بوو، چونکە مالک بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە عثمان پێش ئەخات بەسەر علي رضي الله عنهم جميعا .

ئیمامی مالک فەرموودەی رسول الله ﷺ ی ڕیوایەت نەئەکرد ئیللا بە دەستنوێژەوە نەبێت .

وە لە کتێبی الموطأ ـدا زۆر بەڵگە بە قورئان ئەهێنێتەوە .

وە لە کتێبی الموطأ دا فەرموودەی مُرسَل ی زۆر تێدایە، بەڵام هێناویەتی لەبەر ئەوەی فەرموودەکە پشتگیری کراوە بە فتوای هاوەڵان و تابیعیەکان .

- کاتێک لە خوشکەکەیان پرسی : (مالک لە ماڵەوە خەریکی چییە ؟) .

وتی : (نوێژکردن و قورئان خوێندنەوە) .

بزانە رحمک الله ئیمامەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە لە موفەسیر و فەرموودەوان و فەقیهەکان بەردەوام خەریکی قورئان خوێندنەوە و لێوردبوونەوەی بوون .

## الإمام حَماد بن زَيد البَصري (٩٨ – ١٧٩ هـ)

- عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (ئیمامەکانی خەڵکی لەکاتی خۆیاندا چوار دانەن، سفيان الثوري لە کوفە، مالک لە حیجاز، الأوزاعي لە شام و حماد بن زيد لە بەسرە) .

وە ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە لە نووسەرەوانی فەرموودە حافظ تر بێت لە حماد بن زيد) .

- يحيي بن يحيي النيسابوري ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی حماد بن زيد حافظ بێت) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (حماد بن زيد لە پێشەوایانی موسوڵمانانە) .

سِيبَوَيه (١٤٨ - ١٨٠ هـ) ئیمامی زانستی النَحو تەلەبەی حماد بن زيد و حماد بن سلمة بووە .

- الخليلي دەربارەی حماد بن زيد ئەڵێت : (ثِقةٌ مَتَفَقٌ عَلَيِة، رَضِيَهُ الأئِمة) .

هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالک لە بەسرە بووە، وە تەلەبەی زۆر بووە، حماد بن زيد تەلەبەی زۆرێک لە تەلەبەکانی بووە .

وەکو :

- ثابت البُناني .

- حُمَيد الطَويل .

- خالِد الحَذاء .

وه تەلەبەی أبو حازم سَلَمة بن دينار المَدني بووه .

وه تەلەبەی تەلەبەکانی الحسن البصري بووه .

تەلەبەی عَمرو بن دينار المَكي بووه .

تەلەبەی هشام بن عروة بووه .

حماد بن زيد له هەموو کتێبەکانی فەرمووده‌دا ڕیوایەتی لێوه کراوه .

## الإمام عبدالله بن المُبارَك الخراساني (١١٨ - ١٨١ هـ)

له مَرو لەدایک بووە، مَرو بەشێکە لە خۆراسان، خۆراسان ئێران و ئەفغانستان و پاکستانی ئێستایە .

ئیمام أحمد یش هەر لە مَرو لەدایک بووە .

عبدالله بن المبارک مەولای بَني تَمیم ە .

تەلەبەی سێ لە تەلەبەکانی هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالک بووە رضي الله عنه .

ئەوانیش :

- سُلَیمان التَیمي .
- عاصم الأحوَل .
- حُمَید الطَویل .

- سفیان بن عیینة دەربارەی ئەڵێت : (فەقیهـ بوو، زانا و زاهید و سەخی و ئازا و شاعیر بوو) .

وە ئەڵێت : (إبن المبارک زانای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و نێوانیانە) .

وە ئەڵێت : (چاوەکانت هاوشێوەی عبدالله بن المبارک نابینن) .

ئیمام إبن المبارک موجاهید بووە، هەمیشە لە موبارەزەکاندا هەڵئەبژێردرا .

موبارەزە ئەوەیە کاتێک دوو سوپا دژی یەک ئەوەستنەوە پێش دەست کردن بە شەڕ ئازاترین جەنگاوەری هەر دوو سوپاکە دێنە ناوەڕاستی مەیدان و شەڕ ئەکەن، وەک چۆن لە جەنگی بەدر ڕوویدا .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (لە سەردەمی إبن المبارک دا هیچ کەسێک نەبووە هێندەی ئەو بەدوای بەدەستهێنانی زانستەوە بێت ) .

وە ئەڵێت : (خۆراسان کەسێکی وەکو إبن المبارک ی لێ دەرنەچووە ) .

إبن المبارک بۆ تەڵەبی زانست چووە بۆ : مصر ، شام، بەسرە، کوفە، مەدینە و یەمەن .

- سفیان الثوري کە شێخی إبن المبارک ە، دەربارەی ئەڵێت : (إبن المبارک زاناترینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە ) .

وە ئەڵێت : (ئەگەر بمەوێت کە ساڵێکدا سێ ڕۆژ وەکو إبن المبارک بم ئەوە ناتوانم) .

- عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هاوشێوەی عبدالله بن المبارک بێت .

پێیان وت : سفیان و شعبة ش ؟

وتی : نە سفیان و نە شعبة ) .

- معمر بن راشد ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە وەکو عبدالله بن المبارک بێت، ئەو شتەی لای ئەو بەدەستی ئەهێنین لەلای غەیری ئەو بەدەستی ناهێنین) .

- أبو الوليد الطيالسي ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە کۆکەرەوەتر بێت لە عبدالله بن المبارک ) .

واتە هەموو سیفاتێکی باشی تێدایە لە زوهد و فیقهـ و جیهاد و . . .

- أبو إسحاق الفزاري ئەڵێت : (إبن المبارک پێشەوای موسوڵمانانە ) .

- نعيم بن حماد ئەڵێت : وتم بە عبدالرحمن بن المهدي : (سفيان الثوري و عبدالله بن المبارک کامیان باشترن ؟

عبدالرحمن وتی : عبدالله بن المبارک .

نعیم وتی : ئاخر خەڵکی لەمەدا هاوڕات نین .

عبدالرحمن وتی : خەڵکی تاقیان نەکردووەتەوە، عبدالله بن المبارک باشترە ) .

عبدالرحمن بن المهدي تەلەبەی هەردووکیان بووە .

- پرسیار کرا لە يحيى بن معين : (عبدالله بن وهب المصري و عبدالله بن المبارک کامیان جێگیرترن لە حَيَوَة ؟

یحیی وتی : عبدالله بن المبارک جێگیرترە لە إبن وهب لە هەموو ئەوەی کە گێڕاویەتیەوە ) .

حَيَوَة شێخێکی میسریە، عبدالله بن وهب یش میسریە، بەڵام عبدالله بن المبارک کە خۆراسانیە لەو جێگیر ترە لە حَيَوَة دا .

واتە پێشیانخست بەسەر ڕاویەکی میسرِی لە فەرموودەی میسرِیەکاندا لەکاتێکدا خۆی خۆراسانیە، ئەمە نیشانەی بەهێزی لەبەرکردن و جێگیربوونیەتی رحمه الله .

- أسود بن سالم ئەڵێت : (إبن المبارك پێشەوایەک بوو ئیقتیدای پێوە ئەکرا، وە لە جێگیرترین کەسەکان بوو لە سوننەتدا، ئەگەر کەسێکت بینی تانەی لێ ئەدات تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلامەتیەکەی ) .

الأوزاعي ئەڵێت : (ئەگەر إبن المبارك ت ببینیایە ئەوە چاوەکانت ئەگەشانەوە ) .

- أبي أسامة الكوفي ئەڵێت : (إبن المبارك لە هاوەڵانی فەرموودەدا وەکو پێشەوای ئیمانداران بوو لەناو خەڵکیدا ) .

- شعيب بن حرب ئەڵێت : (إبن المبارك نەگەیشتووە بە هیچ کەسێک ئیللا لەو باشتر بووە ) .

- إسماعيل بن عياش الشامي ئەڵێت : (لەسەر ڕووی زەوی کەسێکی نییە وەکو إبن المبارك، الله هەر تایبەتمەندیەکی باشی دروست کردبێت پێی بەخشیوە ) .

- عبدالعزيز بن أبي رُزمة المدني ئەڵێت : (هیچ تایبەتمەندیەکی باش نییە ئیللا لە إبن المبارك دا کۆبووەتەوە ) .

هەندێک لە هاوەڵانی إبن المبارك وەکو الفضل بن موسى و مخلد بن الحسين کۆبوونەوە و وتیان : (وەرن با ئەو تایبەتمەندیە باشانە بژمێرین کە لە إبن المبارك دا هەن، جا وتیان ئەمانەی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە : زانست، فیقه، ئەدەب، نەحو،

زمان، زوهد، ڕەوانبێژی، شیعر، شەونوێژ و عیبادەت و حەج و جیهاد و ئازایەتی و جەنگاوەری و هێز، وە وازهێنان لەو شتەی پەیوەندی بەوەوە نییە و ویژدان و کەمی خیلاف لەگەڵ هاوەڵانیدا).

کتێبەکانی إبن المبارك ئەوەندە بەناوبانگ بووە لەناو خەڵکیدا البخاري لە تەمەنی **١٦** ساڵی هەمووی لەبەرکردوون .

## الإمام هُشَيم بن بَشير الواسطي (١٠٤ - ١٨٣ هـ)

تەلەبەی سليمان التيمي و يحيى بن سعيد الأنصاري بووە .

تەلەبەی الزهري بووە، بەڵام هیچی لێوە ڕیوایەت نەکردووە چونکە ئەو کتێبەی کە ئەو فەرموودەیانەی تێدا نووسیبوو لە الزهري یەوە بیستبووی ئەفەوتێت .

شێخی أحمد بن حنبل بووە .

مالک و سفیان ڕیوایەتیان لە هشیم ەوە کردووە هەرچەندە تەمەنی لە هەردووکیان کەمترە .

هیشم بەوە بەناوبانگە کە ئاثاری (مَقطوع) ی زۆر لەبەرە، مەبەست لە ئاثاری مَقطوع وتەی هاوەڵ و تابیعی و ئەوانەی پاشیانە .

## الإمام سفيان بن عيينة الهِلالي(١٠٧ – ١٩٨ هـ)

لە مەککە ژیاوە، لە **١٦** ساڵی دەستی بە تەڵەبی زانست کردووە .

جیاوازی ئەم ئیمامە بەڕێزە لەگەڵ سێ ئیمامەکەی تر پێشتر باسمان کردن ئەوەیە ئەم ئیمامە لەوانی دیکە زیاتر ژیاوە، هەر بۆیە کەسانێکی زۆر کە نەگەیشتوون بە ئیمامەکانی تر گەیشتوون بە ئەم و ڕیوایەتیان لێوە کردووە .

ئیمامەکانی الشافعي و أحمد بن حنبل و يحيى بن معين و علي بن المديني و إسحاق بن راهويه تەلەبەی بوون .

وە الحُمَيدي شێخی البخاري لە تەلەبە هەرە نزیک و تایبەتەکانی إبن عيينة بووە.

سفيان بن عيينة تەلەبەی بەشێک لە تەلەبەکانی هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالك بووە، لەوانە :

- الزُهري .
- إسحاق بن عبدالله بن أبي طَلحة .
- يحيى بن سَعيد الأنصاري .
- سُلَيمان التَيمي .
- حُمَيد الطَويل .

وە تەلەبەی أبي الزبير ی تەلەبەی هاوەڵی بەڕێز جابر بن عبدالله بووە .

تەلەبەی محمد بن المُنكَدِر بووە .

تەلەبەی أبو حازم سَلَمة بن دينار المَدَني بووە .

تەلەبەی عَمرو بن دينار بووە، عمرو تەلەبەی هاوەڵانی بەڕێز عبدالله بن عباس، جابر بن عبدالله وە عبدالله بن عمرو بووە .

تەلەبەی إبن أبي مُلَيكة بووە، إبن أبي مُلَيكة تەلەبەی عائشة و عبدالله بن عباس و عبدالله بن عمر و جابر بن عبدالله بووە رضي الله عنهم .

تەلەبەی أبو بُردة ی نەوەی أبو موسى الأشعري رضي الله عنه بووە .

وە تەلەبەی جعفر الصادق نەوەی علي بن أبي طالب بووە رضي الله عنه .

- الشافعي ئەڵێت : (ئەگەر مالک و سفيان بن عيينة نەبوونایە عیلمی حیجاز ئەڕۆیشت ) .

حیجاز واتە مەککە و مەدینە .

- وكيع بن الجراح ئەڵێت : (نەمبینیوە کەس هێندەی سفيان فەقیهـ بێت لەگەڵ خۆگرتنەوەی لە فەتوادان‌دا ) .

واتە هیچ فەقیهێکم نەبینیوە ئەوەندەی سفيان عیلمی هەبێت، وە لە هەمان کاتدا وەکو سفيان خۆی بگرێتەوە لە فتوادان .

- علي بن المديني ئەڵێت : (نەگەیشتین بە کەسێک لەو حافظ تر بێت ) .

سفيان بن عيينة زۆر گرنگی داوە بە تەفسیر و شەرحی فەرموودە .

- الشافعِي ئەڵێت : (نەمبینیوە هیچ کەسێک هێندەی سفیان بن عیینة باش بێت لە تەفسیرکردنی فەرموودەدا) .

بۆ بینینی بەڕاستخەرەوەی ئەم قسەی الشافعي تەماشای ئەثەری سێیەمی کتاب السنة ی محمد بن نصر المروزي (https://t.me/mejd_henbeli/990) بکە .

سفیان بن عیینة لە هۆزی بني هِلال ە، رسول الله ﷺ دوو ئافرەتی لەم هۆزە خواستووە، ئەوانیش مَیمونة بنت حارِث و زَینَب بنت خُزَیمة رضي الله عنهما .

ئەم ئیمامە بەڕێزە لەساڵی کۆتایی تەمەنیدا (خۆی ٩١ ساڵ ژیاوە) لەبەرکردنی لاواز بووە، هەربۆیە وازی لە گێڕانەوەی فەرموودە هێناوە .

ئیمام خاوەنی کتێبێک بووە بەناو (الجامع)، لە ئێستادا بەشێکی کەمی کتێبەکە ماوە، بەڵام ئەم شتە هیچ زیانێک لە خودی ئیمام و ئێمەش نادات، چونکە بۆ نمونە مسند الحمیدي زۆربەی فەرموودەکانی إبن عیینة ی تێدایە، وە هەموو کتێبەکانی تری سەلەف لە تەفسیر و فەرموودە و فیقهـ پڕە لە ڕیوایەت و قەولەکانی .

## الإمام عبدالله بن وَهب المصري (١٢٥ - ١٩٧ هـ)

تەلەبەی نزیکی مالک بن أنس و لیث بن سعد بووە .

وە تەلەبەی سفیان بن عیینة و تەلەبەی زۆر زانای دیکە بووە .

بەشێک لە کتێبەکانی ماون و چاپکراون .

مالیکیەکان بە بەردەوامی لە کتێبە فیقهیەکاندا ڕیوایەتەکانی لە مالک، وە قەولەکانی خۆی نقڵ ئەکەن، چونکە خۆی فەقیهـ بووە .

ئیمامی مسلم لە صحیح ـەکەیدا زۆر ڕیوایەتی لێوە ئەکات، وە أبي زرعة الدمشقي لە کتێبی (تاریخ) ـەکەیدا زۆر ڕیوایەتی لێوە ئەکات .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (عبدالله بن وهب فەرموودەکانی صحیح ـن، یَفصِل سَماع مِنَ العَرض، فەرموودەکانی چەندە صحیح و جێگیرن ! ) .

(یَفصِل سَماع مِنَ العَرض) واتە : کاتێک فەرموودە ئەگێڕێتەوە ئاماژە ئەدات بەوەی کە فەرموودەکەی لە شێخەکەوە گوێ لێبووە، یان ئەم فەرموودەکانی بەسەر شێخەکەدا خوێندووەتەوە .

چونکە (سَماع) واتە شێخەکە فەرموودە بخوێنێتەوە بەسەر تەلەبەکەیدا .

وە (عَرض) واتە تەلەبەکە فەرموودەی شێخەکە ئەخوێنێتەوە بەسەر شێخەکەدا.

- یحيِ بن معین دەربارەی ئەڵێت : (ثِقة) .

- أحمد بن صالح یەکێکە لە ئیمامە میسرپیەکان لە جرح و تعدیل دا ئەڵێت : (إبن وهب سەد هەزار فەرموودەی گێڕایەوە، نەمبینیوە شامیەک یان حیجازیەک یان میسرپیەک لەو فەرموودەی زیاتر لەبەربێت) .

- هارون بن عبدالله الزهري ئەڵێت : (خەڵکی ڕاجیاوازیان تێئەکەوت لەوەی ئایا مالک چیی وتووە، جا ئەوەستان هەتا إبن وهب بگەڕێتەوە و پرسیاری لێ بکەن) .

واتە شارەزا بووە بە وتەکانی مالک، خەڵکی کاتێک ڕاجیاوازیان تێکەوتووە دەبارەی قەولی مالک لە بابەتێکدا ئەوە پرسیاریان لە إبن وهب کردووە .

- أبو زرعة الدمشقي ئەڵێت : أبو کریب وتی : (إبن وهب لە عبدالرحمن بن قاسم فەقیهـترە) .

عبدالرحمن بن قاسم یەکێک لە تەلەبە هەرە نزیکەکانی مالک بن أنس، وە ڕاوی کتێبی (الْمُدَوَنَة) یە لە ئیمام مالک ـەوە .

- علي بن حسين بن جنيد ئەڵێت : (بینیم أبو مُصعَب الزهري پێگەی إبن وهب ی بە بەرزی ڕائەگرت، وە مەسائیلەکانی مالک ی لە إبن وهب ـەوە گوێ لێبووە).

أبو مُصعَب الزهري یەکێکە لە ڕاویە بەناوبانگەکانی کتێبی الموطأ ی ئیمام مالک.

- حارث بن مسكين ئەڵێت : (لەلای سفیان بن عيينة بووم إبن وهب يشى لەلا بوو، پرسیار لە سفیان کرا ئەویش پرسیارەکەی لە إبن وهب کرد، پاشان وتی ئەمە عبدالله بن وهب شێخی میسرپیەکانە لە مالک ـەوە ئەگێرێتەوە کە ئاوا و ئاوای وتووە).

- عبدالله بن وهب ئەڵێت : (نەزرم کرد لەسەر خۆم هەرکاتێک غەیبەتی کەسێم کرد ئەوە دینارێک ئەکەم بە خێر، جا وازم لە غەیبەت کردن هێنا لە ترسی لەدەستدانی پارەکەم) .

- إبن عديِ ئەڵێت : (عبدالله بن وهب لە بەرێزترینی کەسەکانە، وە ثقة يە).

لیث بن سعد کە شێخی بووە لە هەمان کاتیشدا ڕیوایەتی لێوە کردووە، وە الربیع بن سلیمان المرادي تەلەبەی ئیمام الشافعي ڕیوایەتی لێوە کردووە، وە جیاوازی مردنی نێوان لیث و الربیع **٩٥** ساڵە .

- محمد بن عبدالله بن الحكم ئەڵێت : (عبدالله بن وهب لە عبدالرحمن بن قاسم فەقیهتر بوو، بەڵام وەرع ڕێگری لێ ئەکرد لە فتوادان) .

- محمد بن وضاح ئەڵێت : (مالک بن أنس بە عبدالله بن وهب ی ئەوت فەقیهی میسرپیەکان) .

## الإمام وكيع بن الجراح الرؤاسي (١٢٩ - ١٩٧ هـ)

بە ئەسڵ عەرەبە، بەڵام لە ئەصبەهان لەدایک بووە .

بەناوبانگە بە بەهێزی حفظ و لەبەرکردنی .

چاوێکی نابینا بووە .

کاتێک منداڵ بووە فەرموودەی لە الأعمش ـەوە بیستووە، وە تەلەبەی سفیان الثوري و سفیان بن عيينة و مالک و حماد بن زيد و چەندین زانای تر بووە .

- القعنبي ئەڵێت : (لەلای حماد بن زيد بووین وكيع هات، پاشان هەستا ڕۆیشت .

بە حماد م وت : ئەی باوکی إسماعيل ئەمە هەڵگری زانستی سفیان الثوري ـە.

حماد وتی : ئەگەر بمەوێت ئەڵێم ئەمە باشترە لە سفیان) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی وكيع هۆشیار بێت دەربارەی زانست) .

مەبەستی ئەوەیە وكيع زانیاری لە هەموو بابەتەکاندا هەبووە، لە بابەتی تەفسیر و فەرموودە و و فیقهـ و جەرح و تعديل قسەی هەبووە .

وە ئەڵێت : (وكيع زۆر زۆر لە عبدالرحمن بن مهدي حافظترە) .

وە ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە وەکو وکیع بێت لە العلل و حفظ و السند و أبواب، لەگەڵ خشوع و وەرع دا، هەرگیز چاوەکانم وەکو ئەویان نەبینیوە، زۆر بە باشی فەرموودەی لەبەرە، وە زۆر بە باشی باسی فیقهـ ئەکات لەگەڵ ئیجتیهادکردن و هەبوونی وەرع دا) .

مەبەستی لە (السند و أبواب) ئەوەیە کە وکیع فەرموودەکانی جیاکردووەتەوە لە یەکتری بەپێی کەسەکان و باب ەکان، بۆ نمونە پێی بڵێ فەرموودەکانی أبو بکر الصدیق م رضي الله عنه بۆ ڕیوایەت بکە ئەیکات، وە ئەگەر بڵێیت فەرموودەکانی باب ی الطهارة م بۆ ڕیوایەت بکە ئەیکات .

- یحیي بن معین وتی : (هیچ کەسێکم نەبینیوە باشتر بێت لە وکیع) .

پێیان وت : لە إبن المبارک یش ؟

یحیی وتی : إبن المبارک فەزڵی هەیە، بەڵام هیچ کەسێکم نەبینیوە لە وکیع باشتر بێت، ڕووی ئەکردە قیبلە و فەرموودەکانی بەباشی لەبەر بوو، وە شەونوێژی ئەکرد و لەسەر یەک ڕۆژووی ئەگرت) .

- قاسم الجرمي ئەڵێت : (کاتێک وکیع مێردمنداڵ بوو سفیان الثوري ئەیوت : ئەی الرؤاسي گوێت لە چی بووە ؟

وکیع ئەیوت : فڵانە کەس ئەوەی بۆ گێڕامەوە .

سفیان زەردەخەکەی ئەکرد و سەری ئەسووڕما لە باشیی حفظ ی) .

- إبن عمار وتی : (لە سەردەمی وکیع دا هیچ کەسێک نەبوو لە کوفە هێندەی ئەو زانا و فەقیهـ بێت دەربارەی فەرموودە، لێهاتوو بوو) .

- وكيع ئەڵێت : (ئەوە پازدە ساڵە تەماشای هیچ کتێبێکم نەکردووە تەنها یەک جار نەبێت) .

واتە ئەوەندە حفظ ی باش بووە پێویستی بەوە نەبووە موراجەعەی کتێبەکانی بکاتەوە .

کاتێک سفيان الثوري وەفاتی کرد وكيع یان لە حەقەڵەکانی وانە وتنەوە لە شوێنی سفیان دانا .

- عبدالرزاق ئەڵێت : (سفيان الثوري و مالك و معمر و إبن عيينة م و کێ و کێم بینی، بەڵام هەرگیز چاوەکانم وەکو وكيع یان نەبینیوە) .

وكيع سەد هەزار دیناری لە میراتی دایکی بۆ مایەوە، هەمووی لەپێناو فەرموودەدا سەرف کرد .

کاتێک لە مەجلیسی گێڕانەوەی فەرموودەدا دابنیشتایە ڕووی ئەکردە قیبلە و جووڵە نەئەکرد و هیچ سوێندی نەئەخوارد .

- إبن سعد لە (الطبقات) دەربارەی ئەڵێت : (كان ثِقةً حُجةً مأموناً عالياً رَفيعاً كَثيرُ الحَديث) .

- العقيلي لە (الثقات) دەربارەی ئەڵێت : (كوفيٌ عابِدٌ صالحٌ أديبٌ من حُفاظ الحَديث، و كان يُفتي) .

لە ڕێگەی ڕۆیشتن بۆ حەج دا وەفاتی کرد .

## الإمام يحَيي بن سَعيد القَطان (١٢٠ - ١٩٨ هـ)

به خەلیفەکەی شعبة بەناوبانگە .

تەلەبەی یحیی بن سعید الأنصاري و سلیمان التیمي بووە .

شعبة شێخی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەکاتی هەبوونی خیلافێک لەبارەی رجال ی فەرموودە گەڕاوەتەوە بۆلای یحیی .

تەلەبەی مالک و سفیان الثوري بووە .

- عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (ڕۆژێک من و شعبة ڕاجیاوازیمان لەنێواندا دروست بوو، وتم با یەکێک ببێت بە حەکەم لە نێوانمان .

وتی : ڕازم بە الأحول - واتە یحیی - .

یحیی هات و بڕیاری دژی شعبة دا، واتە پێی وت کە هەڵەیت .

شعبة وتی : (جا کێ بەرگەی ڕەخنەی تۆ ئەگرێت ئەی الأحول ! ) .

شعبة و یحیی هەردووکیان بەوە بەناوبانگن کە زۆر بە توندی نەقد لە رجال ەکانی فەرموودە ئەگرن، وە هەردووکیشیان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا زۆر نەرمونیان و دڵنەرمن .

- يحيي بن معين ئەڵێت عبدالرحمن بن مهدي پێی وتم : (هەرگیز چاوەکانت یەکێکی وەکو یحیی بن سعید القطان نابینن) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هیچ کەسێکمان نەبینیوە لەم بابەتەدا وەکو یحیی بن سعید بێت) .

واتە لە جرح و تعدیل ی رجال ی فەرموودەدا .

وە لە مسائل ی صالح ی کوڕی ئیمام أحمد دا هاتووە کە یحیی بن سعید القطان چۆنیەتی کۆکردنەوەی فەرموودە فێری ئیمام أحمد ئەکات، کۆکردنەوەی فەرموودە بریتیە لەوەی لە بابەتێکدا هەموو فەرموودە صحیح ەکان کۆبکەیتەوە تا لەڕێیەوە لە مەبەستی گشتی فەرموودەکان تێبگەیت .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هیچ کەسێک بەراورد ناکرێت بە یحیی) .

- پرسیار لە ئیمام أحمد ئەکرێت : (ئەگەر ابن المبارك و یحیی بن سعید القطان لە فەرموودەیەکدا ڕاجیاوازیان تێکەوت هی کامیان پێش ئەخەیت ؟

أحمد وتی : هیچ کەسێک پێش ناخەین بەسەر یحیی دا) .

وە ئەگەر یحیی ڕیوایەت لە کەسێک بکات ئەوە ئەبێت بە تعدیل و تەزکیە بۆ ڕاویەکە .

یحیی بن سعید لە سەرەمەرگدا بوو، هاتن بۆلای وتیان : (باشە ناترسیت ئەوانەی کە قسەت لەسەر کردوون - واتە جرح ت کردوون - ببن بە دوژمنت لە قیامەتدا ؟

یحیی وتی : ئەگەر ئەوانە دوژمنم بن پێم خۆشترە لەوەی رسول الله ﷺ دوژمنم بێت لە قیامەتدا) .

- علي بن المديني ئەڵێت : (نەمبینیوە هیچ کەسێک هێندەی یحیی بن سعید بەسوود بێت بۆ ئیسلام و ئەهلەکەی) .

## الإمام عبدالرحمن بن مَهدي العَنبَري (١٣٥ - ١٩٨ هـ)

ئیمامی فەرموودە و جرح و تعدیل و عەقیدە و ئاداب و فیقهـ بووە .

تەلەبەی نزیکی سفیان الثوري و مالک بن أنس و سفیان بن عیینة و حماد بن زید و شعبة و هُشَیم و زۆر شێخی تر بووە .

شێخی أحمد بن حنبل و یحیی بن معین و علي بن المدیني بووە .

وە هەر ئەم بوو داوای لە ئیمامی الشافعي کرد هەتا کتێبێک بنووسێت دەربارەی أصول الفقه، ئەویش کتێبی الرسالة ی نووسی .

زۆر شارەزا بووە بە قەول و فتواکانی سفیان الثوري و مالک بن أنس، هەرکاتێک الشافعي بیویستایە موناقەشەی فتوایەکی مالک بن أنس بکات ئەوە ئەچوو بۆلای عبدالرحمن بن مهدي چونکە زۆر شارەزا بووە بە قەولی مالک .

إبن مهدي تەنها لە کەسی ثقة ـوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە .

- عبدالرحمن بن مهدي ئەڵێت : (خەڵکی فەرموودەیان لە منەوە ئەنووسیوە کاتێک لە مەجلیسی مالک ـدا بووم) .

واتە ئەوەندە حافظ و زیرەک بووە تەنانەت کاتێک تەلەبەی ئیمام مالک بووە فەرموودەیان لێوە نووسیوەتەوە .

- أبو فضل المروزيِ ئەڵێت : (چووم بۆلای يحيى بن سعيد القطان پرسيارم لێکرد دەربارەی شتێک لە فەرموودە، پێی وتم پەیوەستبە بە عبدالرحمن بن مهدي ـەوە).

- لە أحمد بن حنبل يان پرسی : (ئايا عبدالرحمن بن مهدي خەريکی فيقهـ ئەبوو ؟

أحمد وتی : لە فيقهدا زۆر قووڵ ئەبوويەوە).

واتە تەنها ئيمامی جرح و تعديل نەبووە، بەڵکو فەقيهيش بووە.

- أحمد بن حنبل دەربارەی ئەڵێت : (ئيمامێکە لە ئيمامەکانی موسوڵمانان).

- العِجليِ لە کتێبی (الثقات) هێناويەتی (لە عبدالرحمن بن مهدي يان پرسی : ئايا حەز ئەکەيت لە تاوانکێت ببوردرێت ؟ يان فەرموودەيەک لەبەر بکەيت ؟

وتی : فەرموودەيەک لەبەر بکەم).

ئەم وتەيەی إبن مهدي پيشاندەری فيقهـ و تێگەيشتنيەتی، چونکە ئەگەر فەرموودەيەک لەبەر بکات ئەوە إن شاء الله هەتا قيامەت و هەتا ئەو فەرموودە باس بکرێت و لە کتێبەکاندا بنووسرێت ئەوە چاکەی بۆ ئەڕوات.

- عليِ بن المدينيِ ئەڵێت : (عبدالرحمن بن مهدي زاناترين کەس بوو).

وە ئەڵێت : (ئەگەر لە نێوان ڕوکن و مەقامدا سوێندم پێ بخورێت، ئەوە سوێند ئەخۆم بە الله کە هيچ کەسێکم نەبينيوە زاناتر بێت بە فەرموودە لە عبدالرحمن بن مهدي).

وە ئەڵێت : (یحیى بن سعید القطان زاناتر بوو بە رجال ی فەرمووده، وە عبدالرحمن بن مهدي زاناتر بوو بە فەرمووده، وە زانستی عبدالرحمن م نەچواندووه ئیللا بە سیحر و جادوو نەبێت ) .

- الشاذكوني کاتێک عبدالرحمن بن مهدي ئەبینێت لە گێڕانەوەی فەرموودەدا ئەڵێت : (ئەم جنۆكەیە چییە!!) .

ئەم شتانەیان پێ وتووە لەبەر ئەوەی زۆر لێهاتوو و زیرەک و حافظ و جێگیر بووە.

سفيان الثوري لە ماڵەکەی عبدالرحمن بن مهدي وەفات ئەکات، لە کاتی مردنیدا سەری لە کۆشی عبدالرحمن و قاچەکانی لە کۆشی یحیى بن سعید دا بووە .

- الشافعي دەربارەی عبدالرحمن ئەڵێت : (وا نازانم هیچ هاوشێوەیەکی هەبێت لە دنیادا) .

## الإمام يحيى بن آدم الأموي (١٤٠ - ٢٠٣ هـ)

تەلەبەی سفيان الثوري و فضيل بن عياض و إبن المبارك و عبدالله بن شريك زۆر زانای دیکە بووە .

کتێبێکی چاپکراوی هەیە بەناوی (الخراج) .

لە کتێبی (الخراج) بە بەردەوامی فتواکانی سفيان الثوري و الحسن بن صالح بن حي نقڵ ئەکات .

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (یحیی بن آدم بەدوای فێربوونی فیقهەوە بوو) .

واتە تەنها فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە و بەس، بەڵکو توانیویەتی حوکمی شەرعی لە فەرموودەکان دەربکات و فتوای پێ بدات .

- يعقوب بن سفيان الفسوي دەربارەی ئەڵێت : (ثقة یە، فەرموودەی زۆرە و فەقیهە) .

- العِجلي دەربارەی ئەڵێت : (ثقة بوو، کۆکەرەوەی زانست بوو، عاقڵ بوو، وە جێگیر بوو لە فەرموودەدا) .

شێخی ئیمامی أحمد ە .

## الإمام محمد بن إدريس الشافعي المُطَلبي (١٥٠ - ٢٠٤ هـ)

له غَزة لەدايک بووه، لەناو عەرەبە دەشتەكيەكاندا گەورە بووه، هەر بۆيە خاوەن ڕەوانبێژی و زمانێكی زۆر پاراوە، وە زمانی عەرەبی زۆر باشە، گەيشتووەتە ئەو ڕادەيەی زانايانی بواری زمانەوانی عەرەبی قەولی الشافعي لەو بوارەدا بە حوججە و بەڵگە بزانن .

بۆ تەڵەبی فەرموودە چووە بۆ مەككە، بەغداد و يەمەن و ميسڕ .

الشافعي شێخی زۆرە، دوو شێخە هەرە گەورە و بەناوبانگەكەی بريتين له مالک بن أنس و سفيان بن عيينة .

ئيمامی الشافعي بەشێكی زۆری كتێبەكانی له دژی ئەهلی ڕەئی له بابەتە فيقهيەكاندا نووسيوە .

كتێبە هەرە بەناوبانگەكەی ناوی (الأُم) ە، لەناو كتێبی الأُم دا چەند كتێبێكی تری تێدايە .

بۆ نموونە كتێبی (إختلاف الحديث)، لەم كتێبەدا الشافعي جەمعی له نێوان ئەو فەرموودانەدا كردووە كە ڕووكەشی فەرموودەكە وا دەرئەكەوێت پێچەوانەی يەكتر بن.

وە كتێبی (ما خالف فيه أهل العراق علي وإبن مسعود)، ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە رضي الله عنهم له كوفە ژياون، جا الشافعي دێت باسی چەندين بابەت ئەكات كە ئەهلی كوفە موخالەفەی ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزەيان كردووە رضي الله عنهم .

بۆ نوسینی ئەم کتێبی الشافعي سوودی زۆری لە عبدالرحمن بن المهدي بینیوە بەوەی عبدالرحمن چەندین ئاثار لەم بوارەدا بە الشافعي ئەڵێت .

الشافعي لە کتێبی (الرسالة) دا شەرحی بابەتی أصول الفقه و أصول الحديث ئەکات .

الشافعي لە سەردەمی خۆیدا بە (ناصر السنة : سەرخەری سوننەت) ناسراوە، وە بەناوبانگ بەوەی لە موناقەشەکردن لەگەڵ ئەهلی ڕەئیدا زۆر زیرەک و لێهاتوو بووە .

- الربيع بن سليمان کە تەلەبەی نزیکەتی ئەڵێت : (هەموو شەوێک خەتمێکی قورئانی ئەکرد، لە مانگی ڕەمەزانە ڕۆژانە خەتمێک و شەوانە خەتمێکی ئەکرد) .

وە هەتا کۆتایی ژیانی هەموو شەوێک شەونوێژی کردووە .

الشافعي بۆ قورئان خوێندنەوە دەنگی زۆر خۆش بووە .

- الأزهري ئەڵێت : (وتەی الشافعي لە زمانەوانیدا بەڵگەیە) .

- ئیمامی أحمد بن حنبل وازی لە حەلقەی سفيان بن عيينة هێناوە و ڕۆیشتووە بۆ حەلقەی الشافعي، پێیان وتووە : (چۆن واز لە حەلقەی سفيان بن عيينة ئەهێنیت و لەلای ئەم گەنجە دائەنیشیت ؟) .

أحمد وتی : (ئەگەر لەدەستت چوو فەرموودەیەک بە سەنەدی بەرز وەربگریت، ئەوە بە سەنەدی نزم هەر وەری ئەگریت، بەڵام ئەگەر ژیری و عەقڵی ئەم گەنجەت لەدەست چوو لە کوێ شت وا ئەدۆزیتەوە ؟) .

زۆرترین کتێب نووسراوە لە (مناقب) ی ئیمامی الشافعي دا .

کۆمەڵێک زانای ئەهلی سوننە وەکو (زکريا الساجي و الآبري و إبن أبي حاتم) کتێبیان دەربارەی مناقب ی الشافعي نووسیوە .

دایکی الشافعي نەوەی ئیمامی علي یە رضي الله عنه .

دایکی ناوی : فاطمة بنت عبدالله بن حسن بن حسن بن علي بن أبي طالب ە.

- پرسیار لە إسحاق بن راهويه کرا : (چۆن الشافعي ئەم هەموو کتێبەی هەیە و لەکاتێکدا تەمەنی ئەوەندە کەمە ؟

وتی : لەبەر کەمی تەمەنی الله هەموو عەقڵی لەو تەمەنە کەمەدا بۆ کۆکردەوە) .

ئیمامی الشافعي لەلای ئەهلی سوننە و حەدیث زۆر خۆشەویست بووە، بەڵام ئەم خۆشەویستیە نەبووەتە هۆی ئەوەی ئەگەر هەڵەیەکی کرد وەڵامی نەدەنەوە یان بە ڕاستی بزانن .

الشافعي شێخێکی هەیە بەناوی إبراهيم الأسلمي، الشافعي ئەم شێخەی بە ڕاستگۆ داناوە، بەڵام لەلای هەموو ئەهلی حەدیث إبراهيم الأسلمي درۆزنە .

- وە البزار لە (المسند) ـەکەیدا لە باسی إبراهيم الأسلمي دا ئەڵێت : (الشافعي ڕیوایەتی لێوە کردووە، وە ئەمەش قورسە لەسەر ئەهلی حەدیث) .

- علي بن المديني بە کوڕەکەی ئەڵێت : (هەموو قەولەکانی الشافعي بنووسەرەوە چونکە زانیاری و مەعریفەی تێدایە) .

- ابن عبدالحکم ئەڵێت : (ئەگەر زانایەک هەبێت بەڵگە بێت لە هەموو شتێکدا ئەوە الشافعي بەڵگەیە لە هەموو شتێکدا) .

## الإمام أبو داود سليمان بن داود الطيالسي (١٣٣ - ٢٠٤ هـ)

بە ئەسڵ فارسە، وە لە تابعی تابیعینە بچووكەكانە .

تەلەبەی شعبة و سفيان الثوري و زۆر ئیمامی تر بووە .

(المسند) یێكی چاپكراوی هەیە .

- عمرو بن عليِ الفلاس ئەڵێت : (كەسێكم نەبینیوە لە فەرموودەوانان حافظ تر بێت لە أبو داود الطياليسي) .

- عليِ بن المديني ئەڵێت : (هیچ كەسێكم نەبینیوە حافظ تر بێت لە أبو داود الطياليسي) .

- عمر بن شَبَّة خاوەنی كتێبی (تاريخ المدينة المنورة) ئەڵێت : (لە الأصبهان چل هەزار فەرموودەیان لە أبو داود الطياليسي یەوە نووسی بەبێ ئەوەی كتێبی پێبێت) .

- إبراهيم الأصبهانيِ ئەڵێت گوێم لە محمد بن بشار (ناسراو بە بُندار بوو وتی : (بە مردنی هیچ فەرموودەوانێک زیاتر نەگریام لەوە بە مردنی أبو داود الطياليسي گریام) .

وتم : بۆچی ؟

وتی : (لەبەر ئەو حفظ و زانیاری و خۆشی المذاكرة یەی هەیبوو) .

المذاكرة : واتە پێداچوونەوە، بۆ نمونە دوو فەرمووودەوان دائەنیشن پێداچوونەوەی فەرموودە ئەکەنەوە لەگەڵ یەکتر .

- عمرو بن علي الفلاس ئەڵێت گوێم لە عبدالرحمن بن مهدي بوو وتی : (أبو داود الطيالسي لە ڕاستگۆترینی خەڵکیە) .

- أحمد بن فرات الرازي ئەڵێت پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی أبو داود الطيالسي، وتی : (ثِقة ـەکی صَدوق ـە) .

وتم : (ئاخر هەڵە ئەکات!) .

وتی : (چاوپۆشی لێ ئەکرێت) .

ئیمام أحمد وشەی (يُحتَمَلُ لَهُ) ی بەکارهێنا، منیش نەمزانی بیزەبت بە کوردیەکەی چییە بۆیە نووسیم (چاوپۆشی لێ ئەکرێت) .

مەبەستی ئیمام أحمد لێرەدا ئەوەیە کە أبو داود الطيالسي (بۆ نمونە) پەنجا هەزار فەرموودەی لەبەرە، جا ئەگەر (بۆ نمونە) لە پەنجا فەرموودەشدا هەڵە بکات ئەوە چاوپۆشی لێ ئەکرێت، چونکە پەنجا فەرموودە لەچاو پەنجا هەزار فەرموودە هیچ نییە .

- النسائي دەربارەی ئەڵێت : (ثقةٌ مِن أصدَقَ الناسِ لَهجَةً) .

(أصدَقَ الناسِ لَهجَةً) واتە کەسێکە لە ژیانی ڕۆژانەیشدا ئەگەر لەگەڵی بژیت زۆر ڕاستگۆیە، کەسی لەم جۆرە پێی ئەوترێت (صَدوقُ لَهجَة) .

- أبو داود الطيالسي ئەڵێت : (لە هەزار شێخەوە فەرموودەم نووسیوە) .

## الإمام يزيد بن هارون الواسطي (١١٨ - ٢٠٦ هـ)

- أبو بكر بن أبي شيبة ئەڵێت : (هيچ كەسێكم نەبينيوە مُتقِن تر بێت لە يزيد بن هارون) .

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (ئيمامە، پرسيارى لەبارەوە ناكرێت) .

بەوە ناسراوە كە زۆر ئەمرى بە چاك و نەهى لە خراپە كردووە .

المأمون ی جەهمی لعنه الله خەليفەی عەباسيەكان نەيئەوێرا فيتنەی خەلقی قورئان بڵاو بكاتەوە لە ترسی يزيد بن هارون .

يزيد تەلەبەی سێ لە تەلەبەكانی هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالک بووە رضي الله عنه.

لەوانە :

- إسحاق بن أبي طلحة .

- حُمَيد الطَويل .

- يحيى بن سعيد الأنصاري .

وە تەلەبەی أبو مالک الأشجعي بووە، أبو مالک باوكی هاوەڵی رسول الله بووە صلى الله عليه وسلم .

زۆر بەناوبانگ بووە بە شەونوێژ و گريان .

یزید بن هارون ئەڵێت : (بیست و چوار هەزار فەرموودەم بە سەنەدەکانیانەوە لەبەرە و هیچ شانازی ناکەم) .

وە ئەڵێت : (بیست هەزار فەرموودەی شامیەکانم لەبەر و پرسیارم لەبارەیەوە لێ ناکرێت) .

(پرسیارم لەبارەیەوە لێ ناکرێت) واتە ئەوەندە بەباشی لەبەرمە پێویست ناکات پرسیارم لێبکەیت دەربارەی .

شێخی ڕاستەوخۆی ئیمام أحمد بووە .

چەند کتێبێکی هەبووە، بەڵام نەماون .

## الإمام عبدالرزاق بن هَمام الصَنعانِي (١٢٦ - ٢١١ هـ)

كتێبێكی گەورەی بەناوبانگی هەیە بەناوی (المُصَنَف) .

كتێبی (المصنف) لە زیاتر لە نۆزدە هەزار فەرموودە و ئاثار (مسانید و مقاطیع) پێكهاتووە .

تەلەبەی تایبەتی معمر بن راشد بووە، وە كتێبی (الجامع) ی معمر ی لە كتێبی المصنف ـەكەی خۆیدا ڕیوایەت كردووە .

شێخی أحمد بن حنبل و یحیی بن معین و زۆر ئیمامی تر بووە .

وە كتێبی (التفسیر) و (الأمالي) ی هەیە .

تەلەبەی مالک و سفیان الثوري و عبدالله بن المبارک و إبن جریج زۆر زانای تر بووە .

لە كۆتایی تەمەنیدا چاوەكانی نابینا بوون، وە دوای نابینابوونی وەكو پێشووتر ڕیوایەتیان لێوە نەكردووە چونكە فەرموودەكانی لێ تێكەڵ بووە .

- أحمد بن صالح المصري ئەڵێت وتم بە أحمد بن حنبل : (ئایا هیچ كەسێكت بینیوە فەرموودەكانی باشتر بێت لە عبدالرزاق ؟) .

وتی : (نەخێر) .

- أبو زرعة الرازي ئەڵێت : (عبدالرزاق یەکێکە لەوانەی کە فەرموودەکانی جێگیر بووە).

- عبدالوهاب بن همام برای عبدالرزاق ئەڵێت بە تەنها لەلای معمر بووم وتی : (لە ئەهلی یەمەن چوار کەس دێن بۆ تەڵەبی عیلم بۆلامان، رباح بن زید، محمد بن ثور، هشام بن یوسف و عبدالرزاق، رباح کەسێکە کە عیبادەتکردن بەسەریدا زاڵ ئەبێت و ئەوەندە سوود بە خۆی ئەگەیەنێت ئەوەندە سوود بە خەڵکی ناگەیەنێت، وە هشام کەسێکە کە دەسەڵاتدار بەسەریدا زاڵ ئەبێت، وە محمد لەبەرکردنی باش نییە و شتی زۆر بیرئەچێتەوە، وە إبن همام ئەگەر بژی ئەوە تُضرَبَ إلَيهِ أكباد الإبل).

(تُضرَبَ إلَيهِ أكباد الإبل) : واتە سەفەر ئەکرێت بۆلای بۆ تەڵەبی عیلم.

مانای (تُضرَبَ إلَيهِ أكباد الإبل) واتە (لەپێناو رۆیشتن بۆلای لە جگەری حوشتر ئەدرێت)، ئەوانەی کە بەسوار حوشتر ئەڕۆیشتن بۆ ئەوەی حوشترەکە خێرا بڕوات ئەیاندا لەو لایەی کە جگەری حوشترەکەی لێیە، بەم شێوەیە حوشترەکان خێرا ئەڕۆیشتن.

قسەکەی معمر هاتە دی، کاتێک یحیی بن معین و أحمد بن حنبل لە بەغداد ـەوە رۆیشتن بۆ حەج، دوای حەج رۆیشتن بۆ یەمەن بۆلای عبدالرزاق.

- علي بن المديني ئەڵێت هشام بن یوسف پێی وتم : (عبدالرزاق زاناترین و حافظترینمان بوو).

- عبدالرزاق ئەڵێت : (سێ کەس شتیان لە منەوە نووسیوە، ئەگەر جگە لەو سێ کەسە هیچ کەسێکی تر شتم لێوە نەنووسێتەوە بەلامەوە گرنگ نییە، إبن

الشاذكوني، و يحيى بن معين كە زاناترينى كەسە بە رجال ی فەرموودەکان، وە أحمد بن حنبل كە زاهيدترينى خەڵكيە).

إبن الشاذكوني تووشی خواردنەوەی عارەق ئەبێت و هەجر ئەکرێت و کەس هیچی لێوە نانووسێتەوە .

## الإمام أبو نُعَيم الفَضل بن دُكَين (١٣٠ - ٢١٩ هـ)

شێخی أحمد بن حنبل و يحيى بن معين و البخاري و زۆر ئیمامی تر بووە .

لە هەر شەش کتێبەکەی فەرموودە ڕیوایەتی لێوە کراوە .

کتێبێکی چاپکراوی هەیە بەناوی (الصلاة) .

لە ئەتباعی تابیعینە چونکە فەرموودەی بیستووە لە الأعمش (**٦١ - ١٤٨** ه) .

تەلەبەی سُفیانَین و حَمادَین و شُعبة و زۆر ئیمامی بەڕێزی تر بووە .

کەسێکی سوعبەتچی بووە، وە پارەی وەرئەگرت لەسەر وتنەوەی فەرموودە، ئەهلی سوننەش لەسەر ئەمە زۆر ڕەخنەیان لێ ئەگرت و پێیان ناخۆش بوو، بەڵام أبو نعیم بەهۆی کارنەکردن و زۆری منداڵ لەبەر پێویستی ئەو پارەیەی وەرگرتووە .

کاتێک المأمون بانگی کرد بۆ وتنی قورئان مخلوق ە، أبو نعیم ڕەتی کردەوە، وتیان ئەگەر ئەو شتە نەڵێیت کە ئێمە ئەمانەوێت ئەوە مەعاشەکەت ئەبڕین، وتی نایڵێم، هەر بۆیە مەعاشەکەیان بڕی .

- أبو نعیم ئەڵێت : (بەشداریم کرد لەگەڵ سفیان الثوري دا لە چل بۆ پەنجا شێخ دا) .

واتە أبو نعیم چل بۆ پەنجا شێخی هاوبەشی هەیە لەگەڵ سفیان الثوري شێخیدا.

- محمد بن عبدة بن سليمان ئەڵێت : (لەگەڵ أبو نعيم دانيشتبووم هاوەڵانی فەرمووده پێیان وت : ئەو هەموو فەرموودەیەی لە الأعمش وە بیستووتە !

أبو نعيم ئەڵێت : جا من چی بووم لەلای الأعمش، لەلای ئەو مەیمونێکی بێ کلک بووم) .

أبو نعيم مەبەستی ئەوەیە کە کاتێک لەلای الأعمش بووە تەمەنی زۆر منداڵ بووە، وە الأعمش زۆر تەلەبەی تری هەبووە وەکو سفيان و شعبة ی شێخی أبو نعيم .

أبو نعيم (الأحول : چاوی خێل) بووە .

- وكيع ئەڵێت : (ئەگەر ئەم أبو نعيم هاوڕام بێت گرنگ نییە بەلامەوە کێ موخالەفەم ئەکات) .

وە پێیان وتووە پێشەوای ئیماندارانی فەرموودە لە کوفە .

## الإمام عبدالله بن الزُبير الحُميدي القُرَشي (٢١٩ هـ)

تەلەبەی تایبەتی سفیان بن عیینة بووە و جێگیترین کەس بووە لە إبن عیینة، وە شێخی البخاري بووە .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (الحمیدي لەلای ئێمە ئیمامە) .

کتێبێکی چاپکراوی هەیە بەناوی (المسند) .

کتێبێکی هەبووە بەناوی (الرد على أبي حنيفة) بەڵام فەوتاوە .

کتێبێکی تری هەبووە بەناوی (النوادر) کە تێیدا باسی زانستی فەرموودەی کردووە بەڵام فەوتاوە .

فەقیهـ بووە و البخاري لە (الصحیح) ـەکەیدا وتەی لە بابەتی فیقهدا نقڵ ئەکات .

البخاري لە (الصحیح) ـەکەیدا یەکەم فەرموودە کە هێناویەتی لە ڕیوایەتی الحمیدي یە .

البخاري لەبەر فەرموودەی (قورەیش پێش بخەن) یەکەم فەرموودە فەرموودەی الحمیدي هێناوە چونکە قورەیشیە .

## الإمام أبو عبيد القاسم بن سلام (١٥٧ - ٢٢٤ هـ)

به ئەسڵ ڕۆمیه، باوكی بەندەیەكی ئازادكراوی ڕۆمی بووە و أبو عبيد ی بردووە بۆلای زانایان تا فێری زانستی بكەن .

سەرەڕای ئەوەی خۆی به ئەسڵ ڕۆمی (ئەورووپی) یه، بەڵام چەندین كتێبی هەیه دەربارەی بوارەكانی زمانەوانی و دەستێكی زۆر باڵای هەبووە تیایاندا .

ناوبانگی دەركردووە به شارەزایی له بواری غريب الحديث .

تەلەبەی سفيان بن عيينة و شريك بن عبدالله و عبدالله بن المبارك و عبدالله بن إدريس و يحيى بن سعيد القطان و زۆر زانای دیكه بووە .

- محمد بن سعد خاوەنی (الطبقات) ئەڵێت : (مُؤَدِب بوو، عەرەبی و نەحو ی به باشی ئەزانی، تەڵەبی فیقهـ و فەرموودەی كردووە، وە قاضي بووە) .

مُؤَدِب واته مامۆستا و تەربیەتدەر، پێشتر خەلیفەكان كه منداڵی كوڕیان بووە مامۆستایەكیان بۆ گرتووە بۆ ئەوەی به باشی فێری قورئان و فەرموودە و شیعر و نەسەب و زمانی عەرەبی و ڕەوشت و دین و ئەخلاق و زانیاری گشتیان بكات .

يحيى بن معين و علي بن المديني دێن بۆ لای أبو عبيد بۆ ئەوەی كتێبی غريب الحديث ی لەلا بخوێنن، وە أبو عبيد به دەموچاو يحيى و علي ناناسێت و نازانێت كێن.

علي بن المديني پێی ئەڵێت : (ئێمە لە تۆ شارەزاترین دەربارەی سەنەدی فەرموودەکان، تۆ تەنها پێمان بڵێ واتای ئەو وشە نامۆیانە چییە کە لە فەرموودەکاندا هاتووە*) .

أبو عبيد ئەڵێت : (نەخێر، من کتێبەکەتان بەو شێوەیە بۆ ئەخوێنمەوە کە نووسراوە، وە ئێوە کێن ؟) .

علي وتی : (من علي بن المديني م و ئەویش يحيى بن معين ە) .

علي مەبەستی ئەوەیە سەنەدی فەرموودەکانمان بۆ مەخوێنەرەوە، تەنها واتای وشە نامۆکانی فەرموودەکانمان پێ بڵێ و تەواو، أبو عبيد یش ئەڵێت نەخێر من کتێبەکەتان هەمووی بۆ ئەخوێنمەوە .

- إبراهيم بن أبي طالب النيسابوري ئەڵێت پرسیارم کرد لە أبا قدامة دەربارەی الشافعي و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه و أبو عبيد القاسم بن سلام ؟

وتی : (تێگەیشتووترینیان الشافعي یە، بەڵام فەرموودەی کەم لەلایە - واتە لەچاو سێ دانەکەی تر - ، أحمد بەوەرعترینیانە، وە حافظ ترینیان إسحاق ـە، وە شارەزاترینیان بە لەهجەکانی عەرەب أبو عبيد ـە) .

تەماشا بکە إسحاق بن راهويه کە خاوەنی مەزهەبی خۆیەتی و بەراورد ئەکرێت بە ئیمام أحمد لە فيقهو عەقیدە چی ئەڵێت دەربارەی أبو عبيد :

- إسحاق بن راهويه ئەڵێت : (الله حەقی پێ خۆشە، أبو عبيد لە من تێگەیشتووتر و حافظ ترە) .

وە ئەڵێت : (أبو عبيد لە هەمووومان زانیاری زیاترە ) .

- پرسیار لە يحيي بن معين ئەکرێت دەربارەی أبو عبيد، زەردەخەنەیەک ئەکات و ئەڵێت : (من دەربارەی أبو عبيد پرسیارم لێ ئەکرێت! بەڵکو دەربارەی خەڵکی پرسیار لە أبو عبيد ئەکرێت ) .

- الدارقطني دەربارەی ئەڵێت : (إمامٌ ثِقةٌ جَبَل ) .

أبو عبيد ئیمامە لە قیرائاتەکانی قورئانیشدا .

## الإمام يحَي بن مَعين البَغدادي (١٥٨ - ٢٣٣ هـ)

تەلەبەی عبدالله بن المبارك و سفيان بن عيينة و زۆر زانای تر بووە .

هەندێک لەو کتێبە چاپکراوانەی کە تێدا تەلەبەکانی پرسیاریان لێ کردووە و ئەویش وەڵامی داونەتەوە :

التاريخ الدوري

التاريخ الدارمي

سؤالات إبن محرز

سؤالات إبن جنيد

سؤالات إبن طالوت

يحيى بن معين لە هەموو ئەو کەسانەی باسمان کردووە و باسیان ئەکەین (إن شاء الله) زیاتر خەریکی بابەتی رجال ی فەرموودە بووە و تێیدا قووڵ بووەتەوە، تەنانەت ئەوترێت وتەی هەیە لەسەر هەموو ڕیجالەکانی فەرموودە .

وشە و دەستەواژەی زۆر توندی بەکارهێناوە بەرامبەر ڕاوی و رجال ـەکانی فەرموودە، بۆ نمونە کاتێک سوَيد بن سعيد الحَدَثاني فەرموودەیەکی مونکەر ئەگێڕێتەوە، يحيى ئەڵێت : (ئەبێت شەڕی لەگەڵ بکرێت، ئەبێت ماڵەکەی بڕوخێنرێت، لەگەڵ چل ماڵ لەلای ڕاستی ماڵەکەی، وە چل ماڵ لەلای چەپی ماڵەکەی) .

بەم شێوەیە أبو زكريا رحمه الله تووند بووە لەسەر فەرموودەکانی رسول الله صلی الله عليه وسلم .

- علي بن المديني ئەڵێت : (نازانین هیچ کەسێک هەبێت لە ئادەم ـەوە علیه السلام هەتا ئێستا هێندەی یحیی بن معین فەرموودەی نووسیبێت ) .

- محمد بن نصر الطبري ئەڵێت : (چوومە لای یحیی بن معین ئەوەندە و ئەوەندە دەفتەرم لەلای بینی، گوێم لێبوو یحیی وتی : بە دەستی خۆم هەزار هەزار فەرموودەم نووسیوە ) .

هەزار هەزار فەرموودە واتە یەک ملیۆن، پێشتر هەر هەزار فەرموودەیەکیان لە دەفتەر یان کتێبێکدا کۆردووەتەوە، بەو شێوەیە یحیی هەزار فەرموودەی نووسیوە .

یحیی هەموو فەرموودەیەکی نووسیوەتەوە، واتە بە سەحیح و زەعیف و مونکەر و درۆ و هەڵبەستراو و هەموو جۆرەکانی تریەوە، ئەمەش بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی هەموو فەرموودەیەکی نووسیوەتەوە، وە لە کاتێک گێڕانەوەدا تەنها فەرموودەی سەحیح ی گێڕاوەتەوە .

- أحمد بن عقبة ئەڵێت پرسیارم کرد لە یحیی بن معین : (چەند فەرموودەت نووسیوەتەوە ئەی أبا زكريا ؟

وتی : بەم دەستەم شەشسەد هەزار فەرموودەم نووسیوە ) .

یحیی بن معین لەلای نعیم بن حماد بوو، نعیم فەرموودەیەکی لە عبدالله بن المبارک ـەوە گێڕایەوە، یحیی بن معین وتی سوێند بە الله هەرگیز عبدالله بن المبارک ئەم فەرموودەیەی نەگێڕاوەتەوە .

نعیم بن حماد تەماشای کتێبەکانی کردەوە زانی هەڵەی کردووە، وتی : ئەو کەسە لە کوێیە کە ئەڵێت یحیى بن معین پێشەوای ئیمانداران نییە لە فەرموودەدا؟ من هەڵەم کرد، وە فەرموودەکە لە کتێبەکانمدا بەو شێوەیە نییە کە گێڕامەوە .

وتەیەکی بەناوبانگی هەیە کە ئەڵێت (واتای قسەکەی نقڵ ئەکەم) : (ئەگەر فەرموودەت نووسیەوە ئەوە هەموو فەرموودەیەک بنووسەرەوە، ئەگەر فەرموودەت گێڕایەوە ئەوە ئاگاداری ئەو فەرموودانەبە کە ئەیگێڕیتەوە - واتە تەنها فەرموودەی صحیح بگێڕەرەوە - ) .

- علي بن المديني ئەڵێت : (زانستی حیجاز - مەککە و مەدینە - لەلای الزهري و عمرو بن دینار کۆبوویەوە

وە زانستی کوفە لەلای الأعمش و أبي إسحاق کۆبوویەوە

وە زانستی بەسرە لەلای قتادة و یحیى بن أبي کثیر کۆبوویەوە

پاشان إبن المديني دێت باسی تەبەقەکانی تر ئەکات و لە کۆتاییدا ئەڵێت : زانستی هەموو ئەمانەش لای یحیى بن معین کۆبوویەوە) .

أحمد بن حنبل لە صنعاء یحیى بن معین ی بینی لە سووچێکدا فەرموودەی (معمر عن أبان عن أنس) ی ئەنووسیەوە، ئەگەر کەسێک بەلای یحیی دا بڕۆیشتایە دەفتەرەکەی ئەیشاردەوە .

أحمد پێی وت : (ئایا فەرموودەی معمر عن أبان عن أنس ئەنووسیت لەکاتێکدا ئەزانیت هەڵبەستراوە؟ وە خۆشت بە خراپ باسی أبان ئەکەیت؟) .

یحیی وتی : (ڕەحمەتی الله ت لێبێت، ئەم فەرمووده‌یانە لە ڕێگەی عبدالرزاق ـەوە بەم سەنەدە لەبەر ئەکەم و ئەشزانم هەڵبەستراون، بەڵام بۆ ئەوەمە کەس نەیەت لە سەنەدەکەدا (أبان) بکات بە (ثابت) و سەنەدەکە بکات بە (معمر عن ثابت عن أنس)، ئەگەر وای کرد ئەڵێم درۆت کرد لە (معمر عن أبان) ـەوەیە نەک لە (معمر عن ثابت)).

بزانە رحمک الله کەسێکی وەکو یحیی بن معین ئەوەندە شارەزایی هەبووە و قووڵ بووەتەوە لە فەرموودەدا ئەڕوات ئەو فەرموودەیانەش ئەنووسێتەوە و لەبەری ئەکات کە درۆ و هەڵبەستراون، بۆ ئەوەی هیچ کەسێک نەیەت چەواشەکاریەک لە سەنەد یان مەتنەکەدا بکات بەو هۆیەوە خەڵکی بە صحیح ی بزانن .

یحیی بن معین ئەڕوات بۆلای عفان و پێی ئەڵێت : (فەرموودەکانی حماد بن سلمة م بۆ بگێڕەرەوە) .

عفان ئەڵێت : بۆ نەتبیستووە ؟

یحیی ئەڵێت : (لە پازدە شێخەوە بیستوومە بەڵام ئەمەوێت زیاتر جێگیر بم!) .

- أحمد بن حنبل ئەڵێت : (هەر فەرموودەیەک یحیی بن معین نەیزانێت ئەوە فەرموودە نییە) .

- يحيِي بن معين ئەڵێت : (جاری وا هەیە فەرموودەیەک ئەگێڕمەوە شەوەکەی خەوم لێ ناکەوێت لە ترسی ئەوە هەڵەم تێدا کردبێت) .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵێت : (خەڵکی ئەیانەوێت ئێمەش وەک أحمد بین، والله ئێمە وەکو أحمد نین) .

یحیی بن معین لەبەر فەرمووده دنیای ڕەت کردەوە، باوکی ملیۆنێک دیناری بۆ بەجێهێشت هەمووی سەرف کرد لە فەرموودەدا هەتا وای لێهات نەعلی نەبوو بیکاتە پێی .

- العجلي ئەڵێت : (الله تعالی هیچ کەسێکی دروست نەکردووە ئەوەندەی یحیی بن معین شارەزای فەرموودە بێت) .

لە ڕێگەی ڕۆیشتن بۆ حەج لە مەدینە وەفاتی ئەکات، کاتێک وەفاتی کرد دارەمەیتەکەی رسول الله یان ﷺ دەرکرد و یحیی یان خستەسەری و وتیان أبو زکریا شایەنی ئەوەیە بخرێتە سەر ئەم دارەمەیتە چونکە بەرگری لە فەرموودەی رسول الله ﷺ ئەکرد .

## الإمام علي بن المديني (١٦١ - ٢٣٤ هـ)

ناوبانگی بەوە دەرکردووە کە ئیمامی زانستی العلل ـە .

یەکێکە لە سێ حافظ ترینی مێژووی ئوممەتی ئیسلامی، دووانەکەی تریش یحیی بن معین و أحمد بن حنبل ـن رحمهم الله تعالی .

- أبو حاتم الرازي دەربارەی ئەڵێت : (علي نیشانەیەکی دیار بوو لەناو فەرمووانانەدا بە زانستی فەرموودە و عیلەل، وە أحمد بەناوی خۆی بانگی نەئەکرد، بەڵکو بە کونیەکەی (أبو الحسن) ناوی ئەهێنا لەبەر ڕێز و پێگەکەی، هەرگیز نەمبینیوە أحمد بە ناوی خۆی بانگی بکات) .

سفیان بن عیینة ی شێخی جارێکیان فەرموودە لە علي بن المدیني ئەگێڕێتەوە، بە سەنەدی علي عن عاصم بن إبن جریج عن عمرو بن دینار، لەکاتێکدا سفیان بن عیینة تەلەبەی تایبەتی عمرو بن دینار بووە .

ئەم ڕیوایەت کردنەی إبن عیینة لە علي، پێگە و بەرزی علي دەرئەخات، لەگەڵ ڕاستگۆیی و سەرڕاستی إبن عیینة .

- سفیان بن عیینة ئەیوت : (لۆمەم ئەکەن لەسەر خۆشەویستی زۆرم بۆ علي! سوێند بە الله ئەوەندەی من لەوەوە فێر ئەبووم ئەو لە منەوە فێر نەئەبوو) .

سفیان بن عیینة ئەگەر لە فەرموودەیەک شک و گومانی هەبووایە ئەیوت : (ئەگەر علي بن المدیني لێرە بووایە!) .

- عبدالرحمن بن المهدي ئەڵێت : (علي بن المديني زاناترین کەسە بە فەرموودە، وە بە تایبەتی بە فەرموودەی سفیان بن عیینة ) .

- يحيي بن سعيد القطان ئەڵێت : (لۆمەم ئەکەن لەسەر خۆشویستنی علي لەکاتێکدا شتی لێوە فێر ئەبم ) .

یحیی بن سعید القطان ئەیوت مانگێک یان زیاتر یان کەمتر فەرموودە بۆ هیچ کەسێک ناگێڕمەوە، پاشان ئەیوت تەنها بۆ علي بن المديني نەبێت .

علي بن المديني شێخی تایبەتی البخاري بووە، البخاري لە (الصحيح ) ـەکەیدا لە زۆر شوێندا فتوا فیقهیەکانی هێناوە .

علي بن المديني سی ساڵ هاوەڵی أحمد بن حنبل بووە رحمهم الله تعالى .

## الإمام أبو خَيْثَمَة زُهَيْر بن حَرْب (١٦٠ - ٢٣٤ هـ)

تەلەبەی جرير بن عبدالحميد و وكيع بن الجراح و سفيان بن عيينة و يزيد بن هارون يحيى بن سعيد القطان و أبو وليد الطياليسي و عبدالله بن إدريس و عبدالرزاق و أبو نعيم و زۆر زانای تر بووە .

وە شێخی البخاري و مسلم و أبو داود و إبن ماجه و إبن أبي الدنيا و أبو حاتم و أبو زرعة و عباس الدوري و زۆر زانای تر بووە .

کونیەکەی أبو محمد بووە، أحمد بن حنبل کردوویەتی بە أبو خيثمة، هەربۆیە بە أبو خيثمة بەناوبانگ بووە .

کتێبێکی چاپکراوی هەیە بە ناوی (العلم) .

وە کوڕەکەی (إبن أبي خيثمة) کتێبێکی چاپکراوی هەیە بەناوی (التاريخ) .

- النسائِي دەربارەی ئەڵێت : (ثِقةٌ مأمون) .

ئیمامی مسلم خاوەنی (الصحيح) زیاتر لە هەزار فەرموودەی لێوە ڕیوایەت کردووە .

- الفريابِي ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە إبن نمير : أبو خيثمة و أبو بكر بن أبي شيبة کامیان بەلاتەوە باشترە ؟

وتی : (أبو خيثمة)، وە زۆری پێدا هەڵدا .

## الإمام أبو بكر بن أبي شيبة (١٥٩ - ٢٣٥ هـ)

شێخی البخاري و مسلم و أبو داود و النسائي و إبن ماجه یە .

کتێبێکی بەناوبانگی هەیە بەناوی (المُصَنَف) کە لە **٣٨** هەزار فەرموودە و ئەثەر (مسانيد و مقاطيع يان مقطوعات) پێکهاتووە .

تەلەبەی يزيد بن هارون و عبدالله بن المبارك و هشيم بن بشير و إسماعيل بن عليه و زۆر زانای دیکە بووە .

باپیری أبو بكر، واتە أبو شيبة قازی بووە، وە زەعیف بووە .

القاسم ی برای أبو بكر تۆمەتبار کراوە بە درۆزنی .

برایەکی تری هەیە بەناوی عثمان ثِقة یە، شێخی ڕاستەوخۆی البخاري ـە و کتێبێکی هەیە لەسەر بابەتی (خلق الله آدم على صورته) .

أبو بكر جگە لە کتێبی المصنف، کتێبی المسند و الأدب ی هەیە .

کتێبی المصنف ی جیاکردووەتەوە بەگوێرەی بابەتە فیقهیەکان .

وە کتێبی المسند ی جیاکردووەتەوە بەگوێرەی ڕیزبەندی فەرموودەی هاوەڵان، واتە فەرموودەکانی أبو بكر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان علي پاشان . . . بەم شێوەیە رضي الله عنهم جميعا .

- الجُرجاني ئەڵێت : (لەگەڵ أبو بکر بووم لە سەحرای كِندة، پێم وت ئەی أبو بکر کاتێک لە شریک بن عبدالله ەوە گوێت لە فەرموودە بوو چەند ساڵان بوویت ؟

وتی : گوێم لە شَریک بوو کاتێک چواردە ساڵان بووم، وە ئەو کاتە لەبەرکردم بۆ فەرموودە باشتر بوو لە ئێستام) .

- عمرو بن عليِ ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە حافظ تر بێت لە أبو بکر بن أبي شيبة) .

- أبو زرعة الرازيِ ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە حافظ تر بێت لە أبو بکر بن أبي شيبة) .

ئەم ئیمامە بەڕێزە زۆر بەناوبانگ بووە بە حِفظ ی مَقاطیع .

لە وەسف کردنیدا تەنها ئەوەندەی بەسە کە :

البخاري لە (الصحیح) ەکەی سی فەرموودەی لە ڕێگەیەوە ڕیوایەت کردووە .

وە مسلم (الصحیح) ەکەی هەزار و پێنسەد و چل فەرموودەی لە ڕێگەیەوە ڕیوایەت کردووە .

## الإمام إسحاق بن راهويه (١٦١ - ٢٣٨ هـ)

أبو يعقوب المَرْوَزي، لە نەيسابوور ژياوە .

خاوەنی مەزهەبی تايبەتی خۆی بووە، فەتواكانی لە كتێبی (مسائل الكوسج) و (جامع الترمذي) و (الأوسط) و چەند كتێبێكی تری سەلەفدا نقڵ كراوە .

لە (مسائل الكوسج) الكوسج دێت پرسيار لە أحمد ئەكات، پاشان هەمان پرسيار لە إسحاق ئەكات، زۆرجار إسحاق ئەڵێت : (كما قال)، واتە بەو شێوەيەی أحمد وتی .

هەندێك جاری تر تەنها بەوەوە ناوەستێت، بەڵكو فراوانتر لە ئيمام أحمد قسە ئەكات، وە بەڵگە بۆ فتواكەی خۆی و أحمد ئەهێنێتەوە .

تەلەبەی أبو نعيم الفضل بن دكين و عبدالله بن المبارك و زۆر زانای گەورەی تر بووە .

إسحاق بن راهويە شێخی البخاري و إبن خزيمة و النسائي و زۆر زانای ديكە بووە.

هەر إسحاق پێشنيار بۆ البخاري ئەكات كتێبی (الصحيح) ەكەی بنووسێت .

يەكەمجار ئەهلی ڕەئی بووە، پاشان بووە بە سەرسەخترين دوژمنی ئەهلی ڕەئی و زۆر ڕەددی داونەتەوە، هێندە شارەزای ئەهلی ڕەئی بووە تەنانەت كتێبەكانيشيانی لەبەر بووە .

لە حفظ و فيقهـدا بەراورد ئەكرێت بە أحمد بن حنبل .

- نعیم بن حماد ئەڵێت : (ئەگەر عێراقیەکت بینی قسە ئەکات لەسەر أحمد بن حنبل ئەوە تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلامەتیەکەی، ئەگەر خۆراسانیەکت بینی قسە ئەکات لەسەر إسحاق بن راهویە ئەوە تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلامەتیەکەی، ئەگەر میسریەکت بینی قسە ئەکات لەسەر وهب بن جریر ئەوە تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلامەتیەکەی) .

- قتیبة بن سعید ئەڵێت : (إسحاق ئیمامە) .

- الحمیدي ئەڵێت : (هەتا من لە حیجاز بم، وە أحمد لە عێراق بێت، وە اسحاق لە خۆراسان بێت ئەوە کەس بەسەرماندا زاڵ نابێت) .

- حنبل ئەڵێت : پرسیار لە أحمد کرا دەربارەی إسحاق ؟

وتی : (کەسێکی وەکو إسحاق پرسیاری لەبارەوە ئەکرێت ؟! إسحاق لەلای ئێمە ئیمامە).

- الدارمي خاوەنی (المسند) ئەڵێت : (إسحاق بە ڕاستگۆییەکەی پێشڕەوی ئەهلی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کرد) .

- کاتێک إسحاق وەفاتی کرد محمد بن أسلم الطوسي وتی : (هیچ کەسێک ناناسم ئەوەندەی إسحاق لە الله ترسابێت) .

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (إسحاق ئیمامێکە لە ئیمامەکانی موسوڵمانان) .

- محمد بن یحیي الذُهلي ئەڵێت : (ساڵی **١٩٩** هـ گەیشتم بە هاوەڵمان إسحاق بن إبراهیم لە بەغداد، لە الرصافة زانا و دیارەکانی فەرموودە کۆبووبونەوە وەکو أحمد

بن حنبل و يحيى بن معين و بێجگە لەوانیش، پێشەوەی دانیشتنەکە دانرابوو بۆ إسحاق و هەر ئەویش قسەی بۆ ئەکردن).

- إسحاق بن راهويه ئەڵێت: (گوێم لە هەر شتێک بووبێت ئیللا لەبەرم کردووە، وە شتێکم لەبەرکردبێت لەبیرم نەچووەتەوە).

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت: (باسی حِفظ ی مەتن و سەنەدی إسحاق بن إبراهيم الحنظلي م کرد بۆ أبو زرعة، وتی: نەبینراوە هیچ کەسێک هێندەی إسحاق حافظ بێت).

## شیخ الإسلام أحمد بن محمد بن حنبل الشَیباني (١٦٤ - ٢٤١ هـ)

تەلەبەی سفيان بن عيينة و عبدالرزاق و وكيع و يحيى القطان و عبدالرحمن بن مهدي و الشافعي و إسماعيل بن علية و يزيد بن هارون و يحيى بن آدم و هشيم بن بشير و زۆر زانای تر بووە .

بە ئیجماعی شێخ و هاوتەمەن و تەلەبەكانی ئیمامی ئەهلی سوننە و جەماعەیە .

گرنگی داوە بە لەبەركردنی فەرموودە و تێگەیشتن لێی و فتوا دان پێی .

وە شارەزاییەكی زۆر فراوانی هەبووە لە تەفسیری قورئاندا .

وە ئیمامی رجال و جرح و تعدیل بووە لە هەمان كاتدا .

لەبەر ئەوەی كەسێك بووە لە ئەوپەڕی حەقبێژی و زانایەتی و فەقیهەیەتی و زاهید بوون لە دنیادا، گرنگیەكی زۆر دراوە بە وتە و فتوا فیقیهەكانی، وە لە هەموو ئیمامەكانی تر زیاتر وتەكانی نقڵ كراوە و گێڕدراوەتەوە و پارێزراوە .

هەردوو كوڕەكەی خاوەنی كتێبی (المسائل) ن لە باوكیانەوە، لەم كتێبەدا دێن پرسیار لە باوكیان ئەكەن و ئەویش وەڵامیان ئەداتەوە .

حنبل ی ئامۆزای و، أبو بكر المروذي و، أبو داود و، الشالنجي و، أبو بكر الأثرم و، إبن هانئ و، مهنا الشامي و، حرب الكرماني و، إسحاق الكوسج و، البغوي و، محمد بن ماهان النيسابوري و، الميموني و، أبو زرعة الدمشقي چەند كەسێكی تریش خاوەنی (المسائل) ن لە ئیمام أحمد ـەوە .

خاوەنی ئەم کتێبانەیە :

- المسند .

- فضائل الصحابة .

- الأشربة .

- الإيمان .

- الرد على الزنادقة والجهمية .

- التفسير (ئەم کتێبە فەوتاوە، بەشێکی کەمی پارێزراوە لە کتێبی 'بدائع الفوائد').

یەکێک بوو لەو زانایانەی کە تاقیکرایەوە لەلایەن خەلیفە جەهمیەکانەوە بە وتنی قورئان مخلوق ـە، المأمون فەرمانی کرد أحمد بن حنبل و محمد بن نوح ببەن بۆلای، لە ڕێگادا محمد بن نوح وەفات ئەکات رحمه الله، وە پێش گەیشتنی بە المأمون، المأمون گۆڕبەگۆڕ ئەبێت .

پاشان المعتصم بوو بە خەلیفە، أحمد بن حنبل ی تاقی کردەوە، المعتصم لە کۆی سێ خەلیفەکە لە هەموویان زیاتر ئازاری أحمد ی دا، بەردەوام ئازاری ئەدا، وە أحمد لەبەردەم المعتصم ی جەهمی ـدا لەگەڵ جەهمیەکاندا زۆر موناقەشەی کرد، لە کۆتا جاردا کە زۆر تووڕە ئەبێت لە أحمد لە شەوی زستاندا هەموو پیاوەکانی ناو کۆشک بانگ ئەکات، پاشان فەرمان ئەکات پێیان هەر یەکیو یەک جەلد بە هەموو هێزی خۆیان بدەن لە أحمد، واتە هەر کەسێک تەنها یەک جەلدی لێ بدات، بەڵام جەلدەکە بە هەمووی هێزی خۆی بێت، جا هەرجارێک جەللادەکە بیدایە لە أحمد، المعتصم ئەیوت (توندتر، دەستت بەبڕین بچێت) .

بەم شێوەیە أحمد ئەبوورێتەوە، هەواڵی ئەوە بڵاو ئەبێتەوە لەناو خەڵكیدا أحمد مردووە، المعتصم یش لە ترسی خەڵكی دێت مامی أحمد (كە شێوەی لە أحمد ئەچێت) لە دوورەوە پیشانی خەڵكی ئەدات تا خەڵكی وا بزانن أحمد سەلامەتە و عەیبی نییە .

تەماشا بكە رحمک الله لەم هەڵوێستەی أحمد ـەوە ڕاستگۆیی فەرموودەوانانت بۆ دەرئەكەوێت، ئیمام أحمد تەنها لەبەر نەوتنی یەک وشە (مخلوق) ئامادە بوو ئەم هەموو ئازارە بدرێت، چۆن كەسێكی لەم جۆرە ڕێگە ئەدات بەوەی درۆ بەدەم رسول الله ـەوە صلى الله علیه وسلم بكرێت ؟ بێگومان كاری وا ناكات .

پاش ئەوە المعتصم لە أحمد بێئومێد ئەبێت ئازادی ئەكات .

پاش ئەوە الواثق ی كوڕی المعتصم ئەبێت بە خەلیفە، الواثق ئازاری أحمد نادات، بەڵام ئەڵێت كە نابێت كەس بڕوات بۆ لای، نابێت دەرس بڵێتەوە، وە نابێت دوو لە هاوەڵانی أحمد پێكەوە كۆببنەوە .

- عليِ بن المدينيِ ئەڵێت : (هەڵوێستی أحمد لە میحنەدا وەكو هەڵوێستی أبو بكر الصدیق رضي الله عنه وابوو لە كاتی ڕیددەدا) .

پاشان المتوكل ی برای الواثق ئەبێت بە خەلیفە، المتوكل تاقیكردنەوە هەڵئەگرێت و سوننەت و ئەهلەكەی سەرئەخات، وە بە زۆر شێوازی ویستی أحمد لە خۆی نزیک بخاتەوە بەڵام سەركەوتوو نەبوو .

دووركەوتنەوەی أحمد لە المتوكل بەشێوەیەک بوو تەنانەت أحمد ڕۆژی جومعە نەئەڕۆشت بۆ ئەو مزگەوتەی كە المتوكل نوێژی لێ ئەكرد .

وە المتوكل داوای لێ ئەكات ببێت بە تەربیەتدەر و مامۆستای كوڕەكەی، بەڵام أحمد ڕازی نابێت .

وە پاش بەناوبانگ بوونی أحمد لە دوای تاقیكردنەوەكە، أحمد سوێند ئەخوات ئەگەر تەنانەت یەك فەرموودەش بە سەنەدی خۆی ڕیوایەت بكات ئەوە تەڵاقی ژنەكانی كەوتووە .

لەگەڵ ئەوەدا ئیمامی أحمد فتوای ئەدا و وەڵامی پرسیاری ئەدایەوە .

الميموني پرسیاری فەتواكانی الأوزاعي لە أحمد ئەكرد و ئەویش فتواكانی هەڵئەسەنگاند .

إسحاق الكوسج پرسیاری فەتواكانی سفيان الثوري لە أحمد ئەكرد و ئەویش فتواكانی هەڵئەسەنگاند .

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (الشافعي سوودی زیاتر لە أحمد بینیوە، بەراورد بە سوود بینینی أحمد لە الشافعي ) .

وا باوە كە أحمد فیقهی تەنها لە الشافعي وەرگرتووە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە، زۆرێك لە شێخە بەناوبانگەكانی أحمد وەكو عبدالرحمن بن مهدي و وكيع و يحيى القطان و يحيى بن آدم و چەندین شێخی دیكەی فەقیهـ بوون .

أحمد لەو زانایانە بووە كە زۆر شارەزا بووە بە قورئان و تەفسیرەكەی، ئەگەر لەگەڵ تەلەبەكانیدا دابینیشتایە ئەیوت موصەفەكە بكەرەوە با قورئانت بۆ تەفسیر بكەم .

- يحيى بن معين ئەڵێت : (سی ساڵ هاوەڵێتی أحمد مان كرد یەك وشەمان لێوە نەبیست تێیدا شانازیمان بەسەردا بكات بە ئەو هەموو زانستەی كە هەیەتی ) .

ئیمام أحمد پاش بەناوبانگ بوونی لەدوای میحنەکە زۆر خۆی بەدوور گرتووە لە خەڵکی، عبدالله ی کوڕی ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی باوکم ئارامگرتر بێت لەسەر تەنهایی)، وە أحمد ئەیوت : (هەموو ڕۆژێک ئاواتەخوازم بمرم) .

ئیمام أحمد بە ئەسڵ عەرەبە، بەڵام لە المرو لەدایک بووە، پێش لەدایک بوونی باوکی وەفات ئەکات، وە دایکی لە منداڵیدا ئەیهێنێت بۆ بەغداد .

- أحمد ئەڵێت : (هشیم ساڵی ١٨٣ ﻫ وەفاتی کرد، لەوکاتەدا ئەڕۆیشم بۆ کوفە، پاشان ساڵی ١٨٦ ﻫ چوومە بەسرە، المعتمر ساڵی ١٨٧ ﻫ وەفاتی کرد) .

وە ئەڵێت : (چووم بۆ ئەوەی گوێم لە عبدالله بن المبارک بێت بەڵام نەمبینی چونکە ڕۆشتبوو بۆ جیهاد) .

لێرەدا وتەی هەندێک لە شێخەکانی ئیمام أحمد باس ئەکەین دەربارەی ئیمام :

- وکیع بن الجراح و حفص بن غیاث کە دوو شێخی أحمد ـن ئەڵێن : (هیچ کەسێک نەهاتووە بۆ کوفە وەکو ئەو گەنجە بێت - مەبەستیان لە أحمد ـە - ) .

- جارێک الشاذکوني بە خراپە باسی ئیمام أحمد ئەکات، یحیي بن سعید القطان کە شێخی أحمد ـە بە الشاذکوني ئەڵێت : (ئەی سلیمان لە الله ناترسیت ئاوا باسی زانایەک لە زاناکانی ئەم ئوممەتە ئەکەیت ؟!) .

- أحمد بن سنان ئەڵێت : (نەمبینیوە یزید بن هارون ڕێز لە هیچ کەسێک بگرێت وەک چۆن ڕێز لە أحمد ئەگرێت) .

- عبدالرزاق ئەڵێت : (هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی أحمد خاوەن وەرع و زوهد بێت ) .

- يحيى بن آدم ئەڵێت : (أحمد ئیمامە ) .

- الشافعي ئەڵێت : (بەغدادم جێهێشت هیچ کەسێکم لە پاش خۆم جێنەهێشت فەقیهـتر و زاهید تر و بە وەرع تر بێت لە أحمد بن حنبل ) .

- وە ئەڵێت : (أحمد ئیمامە لە هەشت تایبەتمەندیدا : ئیمامە لە فەرموودە، ئیمامە لە فیقهـ، ئیمامە لە زمان، ئیمامە لە قورئان، ئیمامە لە هەژاری، ئیمامە لە زوهد، ئیمامە لە وەرع، وە ئیمامە لە سوننەت ـدا ) .

- قتيبة بن سعيد ئەڵێت : (ئەگەر أحمد نەبووایە داهێنانی زۆر ئەکرا لە دیندا).

وە ئەڵێت : (أحمد بن حنبل ئیمامی دنیایە ) .

وتەکان کۆتا هات بە وەسفکردنی لەلایەن شێخەکانیەوە .

- المروزي ئەڵێت : (لەلای أبو ثور بووم، پرسیاری لێکرا دەربارەی بابەتێک، وتی : أبو عبدالله أحمد بن حنبل ی شێخ و ئیماممان لەبارەیەوە ئاوا و ئاوا ئەڵێت ) .

- کاتێک ئازاری ئیمام أحمد ئەدرا لە کاتی میحنەکەدا أبو عبيد القاسم بن سلام ئەیوت : (لە گەورەکەمان ئەدرێت! لە گەورەکەمان ئەدرێت!) .

- أبو بكر الأثرم ئەڵێت : (لەلای أبو عبيد القاسم بن سلام بووم قسەیەکم کرد لە بابەتێکدا، وتیان : 'کێ وای وتووە ؟ ' .

وتم : كەسێك كە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی لەو گەورەتری تێدا نییە، أحمد بن حنبل ' .

أبو عبید وتی : 'ڕاست ئەكات' ) .

- محمد بن یحیي الذُهلِي ئەڵێت : (أحمد م كردووە بە ئیمام لە نێوان خۆم و الله دا) .

- أبو عبید ئەڵێت : (هیچ كەسێكم نەبینیوە لە ئەو شارەزاتر بێت لە سوننەتدا).

- عبدالوهاب الوراق ئەڵێت : (أبو عبدالله أحمد بن حنبل ئیماممانە، وە لە ڕۆچووەكانە لە زانستدا ) .

- إسحاق بن راهویە ئەڵێت : (ئەگەر أحمد خۆی قوربانی نەدایە بەوەی كە قوربانی پێدا ئەوە ئیسلام نەئەما ) .

## الإمام أحمد بن صالح المصري (١٧٠ - ٢٤٨ هـ)

زانای فەرموودە و العِلل و جَرح و تَعديل بووە .

تەلەبەی عبدالله بن وهب المصري و أبو نعيم الفضل بن دكين و سفيان بن عيينة و زۆر زانای تر بووە .

شێخی البخاري و أبو داود السجستاني و أبو زرعة الدمشقي و يقوب بن سفيان الفسوي و زۆر زانای دیکە بووە .

کتێبی هەبووە بەڵام فەوتاون، وتەکانی لە کتێبی (تاريخ أبي زرعة الدمشقي) و (معرفة والتاريخ)ی يعقوب بن سفيان الفسوي و چەند کتێبێکی تردا تۆمار کراوە .

- أبو نعيم دەربارەی ئەڵێت : (هیچ کەسێک نەهاتووە بۆ لامان هێندەی ئەم گەنجە شارەزا بێت بە فەرموودەی حیجاز) .

حیجاز واتە مەککە و مەدینە .

- أبو زرعة الدمشقي ئەڵێت : (هاتم بۆ عێراق و أحمد بن حنبل پرسیاری لێ کردم : (لەلای کێ وە هاتوویت لە مصر ؟) .

وتم : أحمد بن صالح .

جا بەمە دڵخۆش بوو و بە باشە باسی کرد و دوعای بۆ کرد) .

- الهروي ئەڵێت : (وتم بە أحمد بن حنبل کێ شارەزاترین کەسە بە فەرموودەکانی إبن شهاب الزهري ؟

وتی : (أحمد بن صالح المصري، وە محمد بن يحيى النيسابوري) .

- يعقوب بن سفيان الفسوي ئەڵێت : (لە هەزار شێخی ثِقة ەوە نووسیمەوە، هیچیان بە شایەت ناگرم لەلای الله تەنها دوو دانەیان نەبێت : أحمد بن صالح لە مصر، وە أحمد بن حنبل لە عێراق) .

## الإمام عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي (١٨١ - ٢٥٥ هـ)

خاوەنی کتێبی (المسند یان سنن الدارمي) ە .

شێخ و هاوڕێی خۆشەویستی البخاري بووە .

زانایەکی فەقیهـ و حافظ و خاوەن وەرع بووە .

- عبدالصمد بن سليمان البلخي ئەڵێت : (پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی یحیی الحماني ؟

أحمد وتی : وازمان لێ هێنا لەبەر قسەی عبدالله بن عبدالرحمن، لەبەر ئەوەی ئیمامە) .

ئەوەندە پێگەی بەرز بووە تەنانەت کەسێکی وەکو ئیمام أحمد شوێنی ئەکەوێت لە جَرح ی ڕاویەکدا و پێی ئەڵێت ئیمام .

- أحمد بن حنبل دەربارەی الدارمي بە کەسێک ئەڵێت : (ئاگات لەو گەورەیە بێت، ئاگات لەو گەورەیە بێت، ئاگات لەو گەورەیە بێت) .

- محمد بن عبدالله بن نُمَير ئەڵێت : (عبدالله بن عبدالرحمن پێشمان کەوت بە حِفظ و وەرع) .

- عثمان بن أبي شيبة ئەڵێت : (عبدالله بن عبدالرحمن لەوە گەورەترە کە باسی ئەکەن لە وەرع و حِفظ و خۆگرتنەوەی نەفس، الله سەلامەتی بکات) .

لەسەر ناخۆشی تاقیکرایەوە سەبری گرت، وە لەسەر خۆشی تاقیکرایەوە سەبری گرت .

لە میحنەی خەڵقی قورئاندا یەکێک بوو لەو زانایانەی تاقیکرایەوە بەڵام خۆڕاگر بوو .

پاشان پێشنیاری بۆ کرا ببێت بە قازی و زۆری لێکرا بەڵام ڕەتی کردەوە .

- أبو حاتم الرازي ئەڵێت : (محمد بن إسماعيل البخاري زاناترین کەسە چووبێتە عێراقەوە، وە محمد بن يحيى الذهلي لەمرۆدا زاناترین کەسە لە خۆراساندا، وە محمد بن أسلم الطوسي خاوەن زیاترین وەرعە، وە محمد بن عبدالرحمن جێگیرترینیانە) .

وە ئەڵێت : (عبدالله بن عبدالرحمن ئیمامی ئەهلی دنیایە) .

- محمد بن إبراهيم بن منصور الشيرازي دەربارەی ئەڵێت : (لە ئەوپەڕی ژیریەتی و عاقڵیەتی و دەستپێوەگرتنی دیندابوو، وە نموونەی پێ ئەهێنرایەوە دەربارەی لەسەرخۆیی و حِفظ و عیبادەت و زوهد، لە سەمەرقەند فەرمووده و ئەثەری سەرخست و بەرگری لێ کرد، وە تەفسیرکارێکی تەواو و فەقیهێکی زانا بوو) .

## الإمام محمد بن يحيي الذُهَلي (١٧٢ - ٢٥٨ هـ)

خەڵکی نەیسابوورە .

تەلەبەی محمد بن عبدالله الأنصاري ی نەوەی أنس بن مالک بووە رضي الله عنه.

وە تەلەبەی سليمان بن حرب و أبو نعيم الفضل بن دكين زۆر زانای دیکە بووە.

- محمد بن سهل بن عسكر ئەڵێت : (لەلای أحمد بن حنبل بووین، محمد بن یحیی الذهلي هاتە ژوورەوە و أحمد لەبەری هەستا، ئامادەبووانی دانیشتنەکە سەیریان پێهات، پاشان أحمد بە کوڕ و هاوەڵەکانی وت : (بڕۆنە لای أبو عبدالله - واتە الذهلي - و لێوەی بنووسنەوە) .

- أبو عبدالرحيم بن الجراح الجزجاني ئەڵێت : (چووم بۆلای أحمد، پێی وتم : ئەتەوێت بڕۆیت بۆ بەسرە ؟

وتم : بەڵێ .

وتی : ئەگەر ڕۆیشتیتە ئەوێ پەیوەستبە بە محمد بن يحيى، با لە ئەوەوە فەرموودە ببیستیت، وە هیچ کەسێکم نەبینیوە هێندەی ئەو شارەزای فەرموودەکانی الزهري بێت) .

- أحمد بن حنبل لەبارەی الذهلي یەوە ئەڵێت : (لەلای من لە فەرمووددەدا ئیمامە) .

- أبو عبد الرحمن السلمي ئەڵێت کاتێک الدارقطني (٣٨٥ هـ) سەیری (علل الحديث الزهري) ەکەی الذهلي کرد وتی : (هەرکەس پێی خۆشە سەیر بکات و کەم و کورتی زانستی خۆی بزانێت لە ئاست زانستی سەلەف دا با بڕوانێ بۆ (علل الحديث الزهري) ەکەی محمد بن يحيى الذهلي) .

سەیری فەزڵی الذهلي لە زانستی علل الحديث بکە کە الدارقطني بۆ خۆی کێویکە ئەو شاهیدیەی بۆ ئەدات .

- أبو حاتم الرازي دەربارەی ئەڵێت : (ئیمامێکە لە ئیمامەکانی موسوڵمانان) .

- النسائي دەربارەی ئەڵێت : (ثِقةٌ مأمون)

- إبن أبي داود دەربارەی ئەڵێت : (پێشەوای ئیمانداران لە فەرموودەدا) .

الذهلي لە ژیانیدا بە مەبەستی تەڵەبی فەرموودە هەژدە جار تەنها سەردانی بەسرەی کردووە !

- إبن خزيمة دەربارەی ئەڵێت : (ئیمامی سەردەمەکەی خۆیەتی بەبێ ڕکابەر) .

البخاري لە (الصحيح) ەکەیدا **٣٤** فەرموودەی لێوە ڕیوایەت کردووە .

والحمدلله رب العالمين